# مناجات

مەلاکەریمی فیدایی

ئەوەی شایانی باسە هەر خودایە
هەرئەو دەرمانی دەردانە ودەوایە

خودا چون کارسازی کاری خەلکە
لەسەر هەرچی شتە ئەمری رەوایە

کری ئەو پاکی شاکار و جوانن
کەم و کەسری لەکاری ئێمە دایە

نموونەی قودرەتی ئەو، تۆدەبینی
کە تێفکری لە ئەو ئەرز وسەمایە

بەهێزی دەستیئەودێتوو دەسوڕێ
کورەی رۆژێ بەباشی لەوحەوایە

بەفەرمانی خودا لەودەشتە پانە
وەکۆ بوو ئەو هەموو کێو وچیایە

دەرەنگێنێ زەوی کاتی بەهاران
بەهەور وبەفروباران و بە بایە

کەدەستووری بە گۆرانی زەویدا
سەری دێنێتەدەر هەرچی گیایە

هەموو سەرگەرمی زیکریئەوخودایەن
گولوک و سەوزە و دار و گەلایە

بەرۆژ وشەو دەهێنێ نێوی باری
دلی بەو زاتە گەورە ئاشنایە

لەدەرگاکەی دەبەن کڕنۆش ودەگرین
ئەوەی مەزن وسەرۆک وپێشەوایە

کەریمێکە بژیوی هەر دەداتێ
بە ئینسانێ کە سپلەوبێ وەفایە

لەبەزمی عیشقی ئەودا بادەنۆشن
تەواوی ئەنبیا و ئەولیایە

هەرئەونەخشەی غەموشادی دەکێشێ
هەرئەو رەنگ رێژی بەزم وماجرایە

خودا وەندا ئەتۆبووی وئەتۆ هەی
کەسێکی تۆ نەناسێ روو سیایە

ئەتۆ پشت وپەناهی بێ کەسانی
لەتۆ ئەوهەی کە دوورە بێ پەنایە

پەنادێنم لەبۆ دەرگاهی بەرزت
دەنالێنم لە قاپی ئەوسەرایە

دەلێم یارەب ئەتۆ گەورەوبەرەحمی
بکە رەحمی بەحالی ئەو گەدایە

فیدایی چون هومێدی هەربە تۆیە
نیەترسی کەچوو عومری بەزایە

ئەگەر بێتو لەوی روو وەربگێڕی
لەدنیا وقیامەت بەر بەلایە

# نێوەرۆک

گۆواری ئەدەبی ـ فەرهەنگی

ناونیشان: ارومیه ـ چهارراه دانش ـ جنب زاندارمری ـ مرکز نشر فرهنگ وادبیات کردی: انتشارات صلاح الدین ایوبی.
تلفن ۳۵۸۰۰

چاپ: از شرکت ایرانچاپ
تلفن: ۳۲۸۱


وێنەی رووبەرگ
دیاری وێنەگری تیشک

وێنەی پشت بەرگ
دەستکردی کوردی خۆراسان
دیاری :کەلیموڵڵا تەوەحودی

## سەروتار

. وێرای سڵاو لە خوێنەرانی بەرێزی سروە ، یەکەمین کۆنگرەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی لە هەموو خوشک و برایانی بەرێز ،پیرۆزبایی دەکەین بەتایبەتی لە خاوەنرایان و هۆگران و لێزانانی فەرهەنگ وئەدەبی کورد. شوکرانەی خودا بۆ ئەم سەرکەوتنە بەجێ بێنین.

بێگومان ئەم کۆنگرە خاوەن شکۆیە مەیدانێکی بەرفرەوانی بۆ باس و لێکۆڵینەوە لە هەموو بارێکەوە کردۆتەوە. ئێمەبە باشمان زانی دەروێکی روون بەناوی" روانینێک لە کۆنگرە" بکەینەوە و لە خاوەنرا دڵسۆزەکانیش بگێرینەوە و داوایان لێ بکەین ئەم دەروە ئاواڵە رابگرن .

پێکهاتنی ئەم کۆنگرە لە مێژووی فەرهەنگ وئەدەبی ئێمەدا رووداوێکی گرینگە و هێزی بازوبردی لایەنگرانی ئەدەبی رەسەنی کوردی کرژتر کرد .

بێ شک ئەم هەڵسوورانە

گەورە، لە مێژووی تێکۆشانی فەرهەنگیدا وەک گۆی زێڕ دەدرەوشێتەوە و بۆ دەست پێکردنی جووڵانەوەیەکی زانستی و ئەدەبی نوێ بناخەیەکی پتەوە کە دەتوانین ژیانێکی گەشە ـ داری پێ دابڕێژین.

پێک هاتنی یەکەمین کۆنگرەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی لە مەهاباد مایەی شانازی هەموانە، بەتایبەتی کۆڕە فەرهەنگی و ئەدەبیەـ کان بە سەرەتای جووڵانەوەیەکی هەراوی فەرهەنگی و ئەدەبی دەزانن. هەروەک لە بڕیارەکانی کۆنگرەدا هاتووە جێگای لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیەکی بەربڵاو بۆ هەموو دڵسۆزانی زانا و هێژا لە هەموو بارێکەوە پێک دێنێ.

بەم جۆرە ئەم ئەرکە دەکەوێتە سەرشانی زانایان کە بە وردی لەسەر زمان و ئەدەبی کوردی کار بکەن و پوخت و پاراوی و ناسکی زمانی کوردی و بارە جوانەـ کانی لە حاڵ و رابردوودا بخەنە بەرچاو. هەروەها زمانی کوردی بکەنە ئامرازی پێشاندانی هەر چەشنە رووداو و دیاردە و بابەتێک کە باسی جوانی تەبیعەت، دەرد و پەژارە، خەم و شادی و هەوراز و نشێوی ژیانی پڕ تەنگ و چەڵەمەی ئێمە و بەرەی ئادەمیزاد دەکا.

مامۆستایان و دین ناسان دەبێ بە دەلیل و بەڵگەی زۆر پەیوەندی قووڵ و لەمێژینەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی لەگەڵ دەریای زانستی ئیسلامی ـ دیاری بکەن و جوانی عارفانە لە ئەدەبی کوردیدا نیشان بدەن و بناخەی ئایینی پیرۆزی

ئیسلام و شەریعەتی محەممەدی (دخ) لە ئەم فەرهەنگەدا باس بکەن و بۆ گەشەونەشەی زمان و ئەدەبی کوردی حەول بدەن. هەروەها پێویستە لە گەنجینەی ئاسەواری زانایان و مێرخاسانی رابردوو، لە کتێب و دیوانی پڕبایەخ کەڵک وەربگرن و پاک و خاوێنی و رەسەنی بیروبڕوای ئیسلامی کە لەنێو دڵی خەڵکدا ریشەی داکوتاوە وەبەر چاو بخەن و ئازایەتی وجوامێری سەردارانی رەشید و موسڵمانی کورد بناسێنن.

ئەوانەی لە دنیای جوان و شاراوە و شەرمێونی "فۆلکۆر"دا دەخولێنەوە دەبێ رابردنی زمان بە وردی لەسیلە چاوی ئەوەهەست وبیرەزوڵاڵەی لە سینگی ژن وپیاوی ئەم وڵاتەدا بەندی یە چاولێ بکەن وسارد وگەرمی زەمانە کەجاروبار وەک لافاوی ماڵ ویرانکەربووە وهێندێک جار وەک شنەی بلاوێن هاورازی ژیانیان بووە بە هەموو کەس بناسێنن، تابەم جۆرە دەرسی کۆڵنەدان وخۆشەـ ویستی وپیاوەتی و ورەی راوەستان ونەوەستان و ودەرووەستی رۆژ لە رۆژ زیاتر لە بەرەی ئادەمیزاددا گەشە پێ بدەن. هەروەها بۆهەموو زانا و خاوەنڕایەک فەرزە لەم دەرفەتە کەڵک وەربگرێ وبە دەکار هێنانی ئەم کەرەستە و ئامرازانەی بەدەستەوەن لە هیچ کۆششێک خۆنەبویرێ و دڵنیابێ کەچارەنووسی داهاتووی ئەم جووڵانەوە فەرهەنگی یە بەدەستومستی

هەمووان جێ بەجێ دەبێ .

باسی "دەبێ و"نابێ"ە بارەکانی تری ئەم جووڵانەوە فەرهەنگی یە لەم وتارەدا ناگونجێ ،بەڵام ئەوەی بەرهەمی بەجێی ئەم کورتە باسەیە ئەوەیە کەبەڕێبوونی کاروانی فەزیلەت وزانست و ئاگاداری وسەرکەوتن لە خەباتی دژی نەزانین و سەرلێ شێواوی هاوکاری هەمووانی دەوێ..

پێک هاتنی کۆنگرەی فەرهەنگی وئەدەبی نەک هەر ئێمە بەڵکوو هەموو کۆڕە ئەدەبی وفەرهەنگی یەکانی غەیرەکوردیشی لەسەرانسەری وڵات شاگەشکە کرد .

بێ شک بووژانەوەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی شوێن دادەنێتە سەردەوڵەمەند بوونی نێوەڕۆکی فەرهەنگ وئەدەبی ئێران وهەنگاوی بەرەوپێش چوونی خۆشتر دەکا .

هەروەها پێک هاتنی ئەم کۆنگرە لەوەها هەل ومەرجێکدا دیاردەیەکی روون وئاشکرایە بۆساغی وپتەوەی رووحی

بەرزی ئامانج وهەستی بەشەر ویستی کۆماری ئیسلامی ئێران. هەروەها دژایەتی یە لەگەڵ جیاوازی دانان لەنێو بەرەی ئادەمیزاددا .

ئەم کاربەدەستە بەڕێزانە بەپێک هێنانی ئەم کۆنگرە بەرزە نیشانیان دا کە چاوڕاوی ژاراوی رەگەزپەرستان وپێ شێل کەرانی سەربەستی ومافی رەوای گەلی کورد تەنیا پەردەیەکە لە شانۆی درۆزنانەی دوژمنانی ئینسانەتی کەدەیانەوێ لە دنیای راپەریوی ئەمڕۆدا درێژە بەگزیکاری و خوێنمژی وچەوساندنەوە بدەن .

لەدواییدا دەبێ بڵێین کەخاوەنڕایان وزانایان قەدری ئەم رووداوە مێژوویی‌یە دەزانن وپێی شوکرانەبژێرن و بەسەرەتایەکی جوان وپڕلە هیوا بۆپێک هێنانی ئاڵ و گۆڕێکی هەراوی بنەڕەتی دادەنێن وبۆگەیشتن بەم ئامانجەپیرۆزە بڕیارەکانی کۆنگرە بەرێوە دەبەن و هەنگاوی پێویست لەم رێبازەدا هەڵدێننەوە . سەرکەوتووبن

دەستەی نووسەران

---

"بسم الله الرحمن الرحیم"

# سرمقاله

بسم الله الرحمن الرحیم

باسلامی گرم بەخوانندگان عزیز"سروه" ، قبل از هر چیز لازم میداند تا صمیمانەترین تبریکات خود را بمناسبت برگزاری اولین کنگرهٔ فرهنگی ـ ادبی کردی به همه برادران و خواهران شریف و بویژه صاحبنظران و علاقمندان و دست اندرکاران فرهنگ و ادب کردی و کلیهٔ خوانندگان محترم تقدیم دارد و بپاس این نعمت بزرگ خداوند مهربان را سپاس‌گوید. بی‌شک برگزاری این کنگرهٔ عظیم جای بحث فراوانی را

در ابعاد گوناگون آن باز کرده که مناسب دیدم ضمن طرح بحثی تحت عنوان چشم اندازی به کنگره از صاحبنظران علاقمند نیز دعوت نمائیم تا باب سخن در این خصوص را گشوده نگاه دارند.

باری برگزاری اولین کنگرهٔ فرهنگی ـ ادبی کردی بعنوان نقطهٔ عطفی در تاریخ فرهنگ و ادبیات ما جهش تازه‌ای به محافل ذیربط بخشیده و مشتاقان ادب اصیل کردی را بسی خشنود ساخت، بی‌شک این حرکت بزرگ، در تاریخ تلاشهای فرهنگی بعنوان نقطه‌ای زرین برای همیشه درخشیده و بعنوان پایه‌ای اساسی برای آغاز یک جنبش نوین علمی و ادبی و یک نهضت فراگیر فرهنگی که همهٔ ابعاد زندگی ما را دستخوش یک سلسله تحولات ضروری و لازم قرار دهد، ثبت خواهد شد.

برگزاری اولین کنگرهٔ فرهنگی ـ ادبی کردی در مهاباد مایهٔ افتخار همهٔ مردم ما بویژه محافل فرهنگی ـ ادبی کردی است. زیرا بعنوان پیش درآمد یک حرکت گستردهٔ فرهنگی و ادبی (چنانکه در قطعنامه کنگره و مصوبات آن مشهود است) زمینهٔ تحقق و تفحص گسترده را **برای همه** صاحبنظران و علاقمندان در تمامی ابعاد فراهم میآورد و بدین ترتیب بر ادیب و سخندان ماست تا با مطالعه‌ای ژرف و عمیق، بلاغت و فصاحت کلام کردی و لطافت و ظرافت

پرداختهای ادبی گذشته و عصر حاضر را یکجا عرضه داشته و توان ادبی ما را در بتصویر کشاندن همهٔ واقعیتها و حقایق ملموس و یا پیچیده، بالهای خیال پاک و بی‌آلایش زیبا، زاویه‌هایی از جمال و صفای طبیعت، دردها، رنجها خوشیها و غمها و فراز و نشیبهای زندگی پرعوغای مردم ما و بشریت امروز و... را بنمایش بگذارد.

بر علماء و دین شناسان است تا با استناد به مدارک و شواهد فراوان و بی‌نیاز از شمار، پیوند عمیق و قدیم فرهنگ و ادب کردی را با دریای بیکران معارف اسلامی در ابعاد زیبایی‌های عارفانه شعر و ادب، خدمات متقابل آندو در گسترش حوزهٔ نفوذ و تحکیم مبانی ایمان به دین مبین اسلام و شریعت محمدی (ص) و نیز گسترش و تقویت زبان و ادب کردی را مورد بحث قرار دهند و با استفاده از آثار علماء و شخصیتهای گذشته و ذخائر گرانبها و گنجینه‌های ارزشمند بجامانده از آنان در قالب دیوانها و کتب نفیس، اصالت و قداست ایمان اسلامی در مردم ما و پایمردی و رشادت سرداران رشید و مسلمان کرد را

تشریح نمایند.

بر سیاحان دنیای زیبا اما محجوب ادبیات عامیانه (فولکلور) است تا با دقتی تمام، گذر زمان را از زاویه اندیشه‌های خالص و ناب محبوس در سینه‌های مردان و زنان این دیار، تصویر کرده و سردی و گرمی روزگار را که گاه چون سیلی محکم و گاه چونان نسیمی روح افزا، آشنای روی آنان و همراز زندگیشان بوده، برای تقدیر از میراثهای بجامانده، محسوس عام کنند و بدین ترتیب با تدریس ماجرای سختکوشیها و پایمردیها، انسها و الفتها، احترام به ارزشهای والای انسانی و معتقدات روحانی و معنوی، روح استقامت و ایثار، دوستی و صمیمیت، پایبندی و تعهد به اصول انسانی و دینی و ... را بیش از پیش در نسل حاضر بدمند. و بهمین صورت بر صاحبان ذوق و نظر در هر زمینه فرض است تا از فرصت بدست آمده سودجسته و با استفاده از ابزار موجود در انجام رسالت و تعهدی که نسبت به مردم و میهن و آئین خود احساس میکنند از هیچ تلاشی دریغ نورزند و مطمئن باشند که سرنوشت آتی این نهضت فرهنگی و همهٔ آنچه که می‌بایدومی‌شاید بسیار است و در این مقال نگنجد. لکن آنچه که در این کوتاه سخن بعنوان نتیجه‌ای قطعی تلقی میگردد، واجب بودن همیاری همهٔ توانمندان این میدان برای براه انداختن کاروان عظیم راهیان کسب فضیلت و آگاهی سیل خروشان جهاد برعلیه جهل و تباهی است.

برگزاری کنگرهٔ فرهنگی ـ ادبی کردی علاوه بر آنکه محافل خودی را سخت ذوق زده کرد، موجبات سرور دیگر محافل فرهنگی ـ ادبی (غیر کردی) در سایر نقاط میهنمانرا نیز فراهم ساخت. چه تبعیض امکان بهره‌گیری از تمامی نقطه‌نظرات در جریان یک تبادل فرهنگی و ادبی برای آرایش و پیرایش ماده و صور غنا بخشیدن به محتوی، تسریع در سیرحرکت و تحکیم مبانی این جنبش عظیم و اصیل فرهنگی بسیار موثر خواهد بود. همچنین تشکیل این کنگره در عصر حاضر ودرمیهن ما نشانه‌ای روشن و دلیلی محکم بر سلامت روح، سعه‌صدر، صفای باطن، تعالی هدف و اوج اندیشه‌های بشردوستانه و ضد تبعیض نژادی مسئولین امر است که با عزمی راسخ و بینشی صحیح با فراهم‌ساختن زمینهٔ تشکیل این مجمع گرانقدر نشان دادند که تبلیغات مسموم نژادپرستان متجاوز به حریم و حقوق و مخالفان حریت کرد دراحیاء فرهنگ و ادب اصیل اسلامی خود، جز پرده‌ای از نمایش دروغین دشمنان انسانیت، برای فریب، دربندکردن و بهره‌کشی زالوصفتانه و ستمگرانه از مظلومین و مستضعفین در جهان رو به بیدار کنونی نیست.

جان کلام آنکه صاحبنظران و علاقمندان، شکر این نعمت بزرگ و تاریخی را سپاس گفته و کنگره را مسئله‌ای پایان یافته تلقی نکرده و آنرا بدید آغازی زیبا و گامی جدی. برای تحول فرهنگی و ادبی بزرگ نگریسته و برای تحقق این مهم مصوبات آن مجمع را پی‌گرفته و برای تحقق این دایره ارزشمند تمهیدات لازم را فراهم آورند.

توفیقتان آرزوی ماست.

هیئت تحریریه

سروه خزمەتکاری فەرهەنگ و ئەدەبی کوردە

# پاییز

سەیدجەلالێ نیزامی

پاییزێ لێدا گول چلمساندن
خەزەل قەراندن دار کورساندن
خەملا بۆستانا دار و کوستانا
تێکدا شەلاندن،تێک هلڤە شاندن
دارا بەرگەهاند ، بنازو زەحمەت
پاییزێ لێدا تەڤدا ڤەراندن
جۆخین گە هیشتن بەکۆلەواری
پاییزێ باران سەردا باراندن
کۆلک و کوختێ فەقیر و ژارا
لێمشتێ لێدا تەڤ هەرفاندن
هێلوونا تەیرو و توالان ڤێکرا
شلۆپێ لێدا تەڤ کمچاندن
ئەمانە هندە پاییز خەرابە
قازانجێ گەلەک ژێ خولقاندن
دانێ پاییزێ دانگێ خێرێیە
ئەوا خوسار بووی تێت جەبراندن
دڤێ پاییزا پڕ لۆمە کاری
تۆڤێ ژیانێ تێتە رەشاندن
دەستێ مەدایە ئەم چ بچینن
ئەم دێ وێ راکەین یا تێتە چاندن
تو دبێ گرانە خەوا پاییزێ
ئەگەر تو رازیی دێ بیێ خاپاندن
شڤانۆ رابە سبەک درەنگە
پەزێ نەیاران پاڤان چەراندن
پاییز کوتا بوو زستان سەردا هات
روحبەر و بێ روح تێک قەرساندن
شیناتی ناڤ چوو عەرد رووسپی بوو
بەفر و بۆرانێ خو داسەلماندن
گشت رەزو پاوان مانە بێ خودان
شڤانا خوەژ پەزا قەتاندن
رەزڤانا رەزێ خو هێلانە جی
جوتیارا جوتێ خو راوەستاندن
بەفرێ داگیر کر نەوال و بانی
سەرمایێ ئاڤا چەما چکاندن
گەرماتی لاچوو هات سڕ و سەقەم

لیڤ جۆک و کانی گشت قەرماندن
بەفر و بۆرانێ گرتن شار و گوند
سێڤی یێد بێ جل تێک رەجفاندن
گەلەک بەلەنگاز مان بێ سۆتەنی
بێ نان و بێ جیئو بێ حەواندن
مێر و ژنێد کال بێ دەم و بێ حال
ب زارِ و خیزان گشت زە براندن
هەم بێ زمهێری هەم ژی نەداری
دل و هنا ڤێد خەلکێ کەلاندن
ئەو خەلکێ نەدار کۆلێ کۆلەدار
ڤێ چەرخا غەددار پشت لێ چەماندن
لڤێ پاییز و لڤێ زستانێ
رحبەران عومرێ خو بهۆراندن
سەرما تەواو بوو گەرمالێ رابوو
بایێ بهارێ بەفر حەلاندن
دەست پێ بوو بهاربوو جیژن وشایی
چیا و چۆلان خو خەملاندن
شالوول و بولبول ژ خۆشییا دل
مزگینی دان و گول پێ حەساندن
شڤان و گاڤان ب پەز و حەیوان
ب شەوق و گەڕیان مالات چەراندن
ژۆردا هاتەخار رۆندکێد عەوران
زەڤی یێد دێم وئاڤ حاسلگەهاندن
ل گوند و باژێر جڤیان ژن و مێر
بۆ پاشەرۆژێ خو جەرباندن
خەبات و شیان ب عیشق و ڤیان
لازمە داکو بێتە قەتاندن
بهار و پاییز همبەری یێکن
بهارە ساخی پاییز مراندن
دەوران دگهۆریت عومر د بهۆریت
وەک دانێ سالێ تێتە زڤراندن
وەک ڤێ پاییز و وەک ڤێ بهارێ
هێڤینێ ژینێ تێتە مەهاندن
بهارا ژینێ ئەم دێ پارێزن
داچرا مرنێ بێتە وەمراندن
(هەوار) بەس بکە گلە و گازندان
تەواو بوو ئێدی رۆندک رژاندن

# «ماموستا مەلا ساحەبی یووسفی»

رێزوسپاس بۆزاتی پاکی خودای گەورە ،ئەو خودایە کە بە هۆی (انما المومنون اخوە ) تەواوی موسولمانانی کردووە برای یەکتر وعیززەت وسەرفیرازی پێ داون .

دروودی بێ پایان بۆسەر رووحی پاکی حەزرەتی محەممەدەلمستەفا (د خ ) ئەو پێغەمبەرە وئەو پێشەوایە کە فەرمانی داوە کۆمەڵانی موسلمان یەک بن ولە هەموو کاتێکدا لە جودایی وناکۆکی و چەندبەرەکی ترساندوون.سەلامی خودا لە سەر ئال و ئەسحاب ویارانی بەدڵ وگیانی بێ کە مانای برایەتی ویەکێتی یان زانی ،بۆیە خودا عیززەت وسەرفیرازی دانێ و دروشمی ئازادی ودێموکراسی یان لە بڵێندایی یەکانی جیهانی مرۆڤایەتی هەڵدا و قەڵا و کۆشکی زۆرداران وملهوڕەکانیان شکاند و سەرە و ژێریان کرد و ناوی ئەوملهوڕوزۆردارانە- یان خستە تاریکایی تاریخ و مەحویان کردەوە .

موسولمانان لە هەر وڵات وهەر رێمێکدا بژین وهەر جۆرە زمان ولەهجەیەکیان بێ و لە هەر رەگەزو میللەتێک بن، یاخۆ هەرجۆرە رەسم وعادەت ولیباس وئادابێکیان هەبێ ، هەموو هەر برای یەکن .

کەوابێ حەقی موسولمان وخاوەنی ئیمان ئەوەیە موسولمانان لە دەست و زمانی سەلامەت بن ،قازانج و زەرەری یەکتر بە ئی خۆ بزانن .

حەزرەتی "محەممەد" (د خ )ی لە سەربێ فەرموویەتی : (**لایومن احدکم حتی یحب لاخیه ما یحب لنفسه** ) واتە کاتێک مومین وموسولمان ئیمانی تەواوە کە بۆخۆی چی پێ خوشە بۆ برای ئایینی خۆی ئەوشتەی پێ خۆش بێ ، و هەروەها چی بۆخوی پێ ناخۆشە وحەزی لێ ناکا بۆ برای دینیشی پێی ناخۆش بێ ونەیەوێ .

کۆمەڵانی ئیسلامی هەموو دەبێ وەک لەشێک وابن ،ئەگەر ئەندامێکی ئێشا و کەوتە نارەحەتی باقی ئەندامەکانیش پێ نارەحەت بن . ، خەو وسانەوەیان نەمێنێ ،هەموو دەبێ وەک عیمارەتێک بن،بەرد وگرانایی وقورسایی یان لەسەر یەک بێ ،یاریدەی یەکتر بدەن ، خەمی یەکتریان لە بەربێ بۆسەربڵیندی یەکتر تێ بکۆشن وهەوڵ بدەن.

جاکە وابوون بەو هۆیەوە بە مرادی دنیا وقیامەت دەگەن ،بە خۆشی ژیان رادەبوێرن خۆشی لە ژیانی خۆیان دەبینن ،خودایان لێ رازی دەبێ ،کاری گرانیان لەبەر هاسان دەبێ ودوژمن لێیان دەترسێ .

کاتێک حەزرەتی"محەممەد" (د.خ)تەشریفی بردە مەدینە ،"ئەنسار" واتە خەڵکی مەدینە لە نێو خۆیاندا دوو هۆز ودوو تایفە بوون موددەعی ودوژمنی یەکتر، زۆریان لە یەکتر کوشتبوو، رەسووڵی خودا نێوبژی کردن و نیزاعیان دەفع بوو ودوژمنایەتی یان لاچوو،

محیبەت وئولفەت وبرایەتی یان کەوتە بەین حەزرەت ئەمری کرد ئەنسار هەریەکەی لە گەڵ مهاجرێک عەهدو پەیمانی برایەتی ببەستن ،جا بەو هۆیەوە خوای مەزن عیززەت وسەربەرزی دانێ،ڕۆژهەڵات ورۆژئاوایان گرت، ناوی مرۆڤایەتی وشەرافەت وغیرەتیان بە هەموو لایەکدا بڵاو بۆوە.

ئاڵای ئازادی یان لەهەموو بەرزایی یەک ولە هەموو شوێنێکی جیهانی زیندووی ئەو کاتە شەکایەوە بە تایبەت "فارس" و "ڕۆم" ئەودوو دەوڵەتە بەهێزەیان داگیرکردو خستیانە ژێردەستی خۆیان و خەزێنەی فارس و ڕۆم لە مەدینەی منەووەرە بەش بەش کرا.

ئەو ئایەتە پیرۆزە ئیشارەیە بەوە کە دەفەرموێ:

**(واعتصموبحبل اللەجمیعا "ولاتفرقوا واذکر ونعمەاللەعلیکما ذکنتما علا"فالف بین قلوبکم فاصبحتمبنعمةاخوانا ) " سورتی آل عمران-١٠٣)**

جارێک جوولەکەیەکی غەلیز بەلای ئەهلی مەدینەدا رادەبرد،کەدیتی پێکەوە بەخۆشی و بە سەفاو بەلەززەت دانیشتوون، ئێرەیی پێ بردن بیری کردەوە کە چۆن وەزعیان بشێوێنێ ،هەستا ئیختیلافات وکێشە و شەڕی پێشووی وەبیر خستنەوە،هەر چەشنە کێشە و دووبەرەکی یەکی هۆزی کە لە بەینیاندا بوو وەبیری هێنانەوە ، جائەو کاتە شەڕ و نیزاعیان پەیدا بوو.

دەستیان دایە چەک وشاڵاو وهێرشیان بۆ یەک برد ، خودای تەعالا ئەو ئایەتە پیرۆزەی نارد:

**(یایها الذین آمنوان تطیعوفریقا من الذین اوتواالکتاب یردوکمبعدا یمانکم کافرین وکیفا تکفرون وانتمتتلی علیکم آیات اللەوفیکمرسولە ) " آل عمران ٩٧و ٩٦ ".**

واتە: ئەی ساحیبانی ئیمان ، ئەی ئیماندارینە ئەگەر ئیتاعە وپەیڕەوی ئەهلی کیتاب بکەن "یەهوود ونەسارا" دەوگێڕنەوە بۆلای کفرو کافری ،پاش ئەوەی کە ئیمانتان هەیە وئەهلی ئیمانن چۆن دەبێ گاوربن و بگەڕێنەوە بۆلای کفرلە حاڵێکدا کەئیمانتان هێناوە وئایاتی خوداتان بۆدەخویندرێتەوەو رەسووڵی خوداشتان لەنێو دایە ....پێغەمبەری خودا (د.خ) تەشریفی چوو وفەرمووی:

ئەی جەماعەتی موسوڵمان تازە دەعوای جاهیلیەتدەکەن لە حاڵێکدا منتان لەنێو دام وخودای گەورە بەقەدری کردوونە بە ئیسلامەتی.

ئەمجار وشیار بوونەوە کە ئەوە مەکری شەیتانە وفێڵی دوژمنان. شەرمەزار و پەشیمان چەکیان فڕێدا وبە گریانەوە دەستیان دەستۆی یەکتر کرد و وێڕای حەزرەتی رەسووڵ گەڕانەوە.

"جابر" خودای لێ رازی بێ کە یەکێکە لە "ئەسحاب" فەرموویە:

نەمدیوە هیچ ڕۆژێک وەک ئەو ڕۆژە ، ئەووەڵ وانا شیرین ونالەبار وئاخروا شیرین وجوان ولەبار. ئەو ئایەتە پیرۆزە و ئەو واقیعە مێژوویی یە پەند و ئامۆژگاری یەکی زۆر بە نرخ وزۆر بەکەلکە بۆ تەواوی موسوڵمانانی جیهان.

ئەوئایەتە پیرۆزە چرایەکی ڕووناکە کە موسوڵمانان لە شەوێکی تار بەرەودنیایەکی ڕوون لە دووبەرەکی بەرەو یەکەتی، لە نەناسی بەرەو ناسینی دوژمنان ڕێنوێنی دەکا وپێیان دەڵێ کە دوژمنانی خودا لە چ ڕێ یەکەوە دێنە ژوور ،وبە چ فێڵ و تەڵەکەیەک نیزاع ودوژمنایەتی بەدی دێنن.

دوێنێ دوژمنانی قەستەسەری موسوڵمانان جوولەکەی غەنزیل بوون وەکوو: "بنی قریظە و"بنی قینقاع" ونەسرانی یەکانی "نەجران"و دوژمنانی ئەوڕۆکەش هەر پاشەڕۆک و ریشەی بۆگەنیوی ئەوانن.

ئەو ئایەتە پیرۆزە ئیعلانێکی جیهانی شۆڕشگێڕانەیە بۆ سەرانی وڵاتەکانی ئیسلامی کە ئەوان ومیللەتەکەیان بانگ دەکا بەرەو یەکێتی وئیمان بە خوداو ڕەسووڵ ئاگاداریان دەکا بۆوشیاری لەپیلانەکانی بەربڵاوی دوژمنانی ئیسلام . یانی دەڵێ :

ئیتاعە وپەیڕەوی لە یەهوود و نەسارا مەکەن . ئیتاعە وپەیڕەوی لە یەهوودونەسارا کفرە بە خودا ، کفرە بە قورعان وپێغەمبەری "عظیم الشان"ی ئیسلام .

بۆچی ؟ چۆن دەفەرموی :(**ان تطیعوا فریقا من الذین اوتوا الکتاب یردوکم بعد ایمانکم کافرین وکیف تکفرون وانتم تتلی علیکم آیات اللەوفیکم رسوله )(سورە آل عمران ٩٧ و ٩٦ )**

سەهیۆنیستی جیهانی نایەوێ موسوڵمانان لە خۆشی وسەفادا بژین ،نایانەوێ بەهرە و سەمەر ومنافیعی وڵاتەکانیان بۆ خۆشبەختی ڕۆلەکان ونەتەوەکانیان خەرج بکرێ، نایەوێ وڵاتیان پێش بکەوێ .

حەز ناکەن فەرهەنگێکی پێشکەوتوو و زانستێکی بەرز لەبەر چاویان بێ . جا بۆ پێک هێنانی ئەو مەبەستە نالەبارەی خۆیان بە هەموو جۆرێک تێدەکۆشن بۆ ئەوەی کە دووبەرەکی وشەڕی ئایینی ومەزهەبی قەبیلەتی ورەگەزی ،بخەنە نێو گەلانی موسوڵمان و ڕۆڵە بەشەرەفەکانی ئیسلامەوە وبۆبەدی هێنانی ئەو پیلانە شەیتانی یە بە هەموو هێزو توانا دێنە مەیدانی خەباتەوە

کەوابێ پێویستە ڕۆڵە دڵسۆزەکانی قورعان وئیسلام لەهەر وڵاتێک ، لە هەر ڕەگەز وقەومێک ولە هەر لەهجەو زمانێک بن ئەو پیلانانە بناسن وبەربەرەکانی لە گەڵ بکەن ودوژمنی قەستەسەر بناسن .

ئەوەش بەچی دەکرێ وچۆن وەدەست دەکەوێ، بە دەستگرتنی هەموو موسوڵمانانی دنیا بە دەستوورەکانی قورعانی پیرۆز و عەمەل کردنیان بەو فەرمانانە وهەر وەها عەمەل کردنیان بە سوننەت و وتارە بەرزەکانی حەزرەتی ڕەسووڵی مەزن درووودی خودای لێ بێ وبە قایم کردن وموحکەم کردنی ئیمان و بیرو باوەڕیان .

ساغ کردنەوەی ئەو ئیمانە ڕاستەقینە و نیشانەی ئەو ئیمانەخەونی یەچیە ؟

نیشانەکەی محیببەت وبرایەتی یە ، بەو جۆرە کە دەوڵەمەند دەستی هەژار بگرێ، بە قووەت یاریدەی موستەزعەف بدا ،ساغ بۆ لای نەخۆش بچێ ولێی بپرسێ ،برابۆ برا پێی خۆش بێ کە منداڵی لە زیادی بێ ،ژن وئەولادی ساڵح بن ،قەدر وحورمەتی ببێ .

نابێ برا زوڵم لە برای دینی بکا ،نابێ درۆی لەگەڵ بکا ،ناڕەوایە فریوی بداوچاڵی بۆ هەڵقەنێ ،نابێ شاهیدی بە درۆی لەسەر بدا ، ڕەوانیە لە سەودا ومعامەلەدا گزەی لێ بکا ، دروست نیە وەسەر سەودای بپەڕێ .

نابێ حەسوودی پێ ببا ،نارەوایە بە چاوی سووک تەماشای بکا ، گاڵتەی پێ بکا ، تانەوتەشەری لێ بداوناوونرتکەی لێ هەڵبدا

موسوڵمانی راستەقینەومرۆڤی باش بە هیچ جۆرێک نابێ خەیانەت بە بەندەگانی خودا بکا .

نە لە شەخسی ئەوان ونەفسی ئەوان و نە لە عیرزو ناموسیان ونە لەماڵ ودەوڵەتیان

بە تایبەت حەققی موسوڵمان ئەوەیە لە ئامۆژگاری وچاکەی برای دینی خۆی کۆتایی نەکا .

لەسەر خێر یاریدەیدا ،لەشەڕی بگێڕێتەوە وبە قەدری ئیمکانی تێ بکۆشێ بۆرێک خستنەوە ودەفعی نیزاعی موسوڵمانان .

ئیسلاح کردنی بەین خێری زۆرە ، خودای گەورە دەفەرموێ :

**(انما المومنون اخوەفاصلحوا بین اخوبکم واتقوا اللەلعلکم‌ترحمون) "حجرات آیە ١١ )**

نێوان ناخۆشی ژیان دەکاتە جەهەننەم ونیزاع دڵی ئینسان دەپرووکێنێ ،سەبەبە بۆ هەم وغەم ،دوژمنی یادی خودا و قەبر و قیامەتە ،ئینسان عومری بە خۆڕایی دەچێ ، هەروا ماڵی لە مەحکەمە وشاهیدو هات و چۆدا دەفەوتێ ،ئینسان تووشی هەموو بێ دینی یەک دەبێ ،ریشوەت‌دەدا ، ریشوەت دەخوا ،داوای ناحەق دەکا ، ئینکاری حەق‌دەکا تووشی سوێندوشاهیدی بە درۆ دەبێ ،وادەبێ تەڵاقیشی نامێنێ ،عاقیبەتی کار دەگاتە دزی ،سووتمان کوشتنی حەیوانان ، تەنانەت کوشتنی ئینسانێکی بێ تاوان وبێ گوناە .

جا خەراپی وشەقاوەتی ئینسانی جانی دەگاتە ئەو پلەورادەیە ، ئەگەر کەسێک نسیحەت وئامۆژگاری کرد ، خەراپەوقەساوە ـ تەکەی زیاد دەکا ،دەبێتە دۆستی زەرەروفەساد جەهەنندەم بۆخۆی دەکا بە مەسکەن ومەئوا .

لە زەمانی حەزرەتی محەممەد دروودی خودای لێ بێ،دوودینێک چوو زراعەت وکشت و کاڵی پیاوێکی سووتاند ،ئاژەڵ وماڵاتەکەی لێ کوشت خودای مەزن ئەو ئایەتە پیرۆزەی دەرحەق بەو دوودینە نارد کە دەفەرموێ :

**(ومن الناس من یعجبک قولەفی الحیاەالدنیا ویشهداللەعلی مافی قلبەوهواللەالخصام واذا تولی سعی فی الارض‌لیفەفیها ویهلک الحرشا والنمل واللەلایحب الفسادواذا قیل لە اتق اللەاخذتەالغرەبالاثم‌فحسبەجهنم‌ولبئس المهاد) ." سورە بقرە ٢٠٤"**

واتە : لە مرۆڤان هەن کەسانێک کە وتاری وان لە باری ژیانی دنیاوە ،بۆ تۆ سەرنج، راکێشە . خودای گەورە بە شاهید دەگرن لە سەر ئەو شتەی کە لە دڵ ودەروونیاندا هەیە. لە گەڵ ئەوەش ئەوانە سەخت‌ترین دوژمنن وکاتێک لە لای تۆ رۆیشتن وروویان وەرگێڕا هەڵدەسووڕێن بۆ ئەوەی خەراپە و فەساد لە زەویدا بکەن ،کشت وکاڵ لە ناو دەبەن ، پیاو وئاژەڵان دەکووژن ولە بەین دەبەن ، کاری وادەکەن کە هەموو خەراپە وفەسادن و خوداش خەراپە وفەسادی خۆش ناوێ ،وهەرکات پێیان بگوترێ لە خودا بترسن و تەقوا بکەن نەزانی وشەیتانی ،هەڵیاندەنێ بۆ گوناە ،جا بۆ ئەوان جەهەندەم بەسە کە جێگایەکی گەلێک خەراپە .

بەو ئایەتە پیرۆزەش چەند مەبەستێکی گرینگ وبە نرخ بۆ ئێمە روون دەبنەوە و دەردەکەون :

بەو دروشمە کە دوژمنانی ئێمە بە قسەی چەور وبەووتاری سەیر وسەرنج راکێش دێنە لامان وعەهد وپەیمانمان لە گەڵ دەبەستن ، پێمان دەڵێن :

ئامانجی ئێمە لەم چەشنە عەهدوپەیمانا ـ نە ولەو نەوعە معامەلانە خزمەتە بە وڵاتی ئێوە ،خزمەتە بە گەلەکەتان،مەبەستمان سەربەخۆیی وئازادی ئێوەیە بۆ بووژانەوەو لابردنی فەقرونەداری .

ئامانجمان لە نێوبردنی نەزانــــــی و بێسەوادی یە ، لابردنی سستی وبێکاری یە .

دەڵێین : هەوڵ وتەقەلامان ئەوەیە گەلە ـ کانمان پێکەوە بە خۆشی وبرایەتی سولح و سەفـــا بژین وفەرهەنگ وزانستمان تێکەڵاوو بە کەلک بێ و ... ولە سەر ئەو وتـــــارە سوێند بە موقەددەسات دەخۆن ،خودای گەورە ، دەکەنە شاهید لە سەر مەرام ومەبەستــــە زاهیری یەکەیان .

دەگەڵ ئەوەش خودا دەزانێ کە درۆ دەکەن وزمان ودڵیان یەک نیە ،قسە وکردەوەیـــان لێک دوورە .

هەوڵ وتەقەلایان بۆ ئەوەیە کۆمەڵانــی موسوڵمان وگەلانی بێ هێزوبێ دەسەڵات هیــچ کات یەک نەگرن ودوژمنی گیان ومالی یەکتــر بن ، تا بتوانن ئێمە تالان بکەن وسەروەتــی ولاتەکەمان بە هاسانی هەڵلووشن .

لە نەتیجە وسەمەری ئەو کارە ولاتەکەی خۆیان بە نیعمەتەکانی ئێمە خەنی بکـــەن ، هەرکە پێیان گوترا ، کوا وایە؟ لە کــوێ قازانجی ئێمەتان دەوێ ؟دەس بەجێ غـــرووری شەیتانی هەڵیان دەنێ بۆ خەراپە ،ئاژاوە و دووبەرەکی نانەوە وکوشتارو سووتمان .

جاکەوابوو پێویستە لە بەرامبەری ئـــەو هەموملهوڕی وزۆرداری یەی ئیستیکباری دزێـــو ونالەباری جیهانی یەوە ،ئێمە موسوڵمانــان لە گەڵ تەواوی گەلانی هەژار وبەش خوراوی دونیا یەک گرین وئاوا کۆشک وقەڵای مــــل هوڕان بڕووخێنین تاکوو خۆمان وگەلانـــی بێ دەسەڵات وزۆرلێکراو لە زنجیـــــری ئیستبداد وئیستیعمار وکۆتی ئەوان رزگـــار بکەین وتەنانەت بەوەشەوە رانەوەستیـــن ، بەڵکوو بە یەکـەتی دنیای سەرانسەر فێــڵ و تەڵەکەی ئەوان بکەینە ئاگر ودووزەخ و بـــە ئیمان وبڕوا بە مستی پوڵای یەکـەتی قەلایـــان بڕمێنین .

ئەی رۆڵە بە شەرەفەکانی ئیسلام وقورعان! ئەی گەلانی وەپاش کەوتوو ،تاکەی ژێرچەپۆکـە بوون وبێ هێزی ،تاکەی ئاژاوەو دووبەرەکی تاکەی ئیستیزعاف .

هەمووتان وەرن یەک دەنگ ویەک رەنـــگ سولح وسەفا وئاشتی پەیدا بکەن ، ئـــەو ئایەتە پیرۆزە بکەنە سەرمەشقی خۆتان کـــە دەفەرموێ :

**(فاتقوا اللە واصلحوا ذات بینکم ،وان طائفە تان من المومنین اقتلوا فاصلحوا بینهما )**

پێغەمبەری خودا دروودی لەسەر بـــێ فەرموویەتی :

**(افضل الصدقە ذات البیق)**

واتە : گەورەترین سەدەقە ئیسلاح وئاشتی بەینی خەڵکە .

حەزرەتی موحەممەد (د.خ) رۆژێک بـــە ئەسحابی کیرامی فەرموو : مزگێنیتان بدەمێ بە شتێکی کە خێروبەرەکەتی لە نوێـــژ و رۆژووی سوننەت وسەدەقەی سوننەت گەورەترە . عەرزیان کرد ئاگادارمان بکە یارسول اللە ، فەرمووی : نێوان خۆش کردن خێری لە نـوێژو رۆژوو و سەدەقەی سوننەت پترە .

هەروەها تێک دانی نێوانی خەڵک ،فەسای دینی ئینسان ناهێڵێ و لە بەینی دەبا .

خودایە بە رەحمەتی خۆت وبە فـــەزڵ و لوتفی بی پایانت بمانپارێزی وبمانخەیـــە سەر رێگەی چاکە و برایەتی وئیسلاح وئیمان . آمیـــن .

**(وآخردعوانا ان الحمدللە رب العالمیـــن)**

# ڕێبازی ڕۆمانتیک

فەرهاد پیرباڵ

زۆرجاران لەگۆوارانداا بەرچاومان دەکەوێ کەرۆژنامەنووسێک لە نەقاشێک دەپرسێ : ( جەنابتان لە چ سەبکێکدا کار دەکەن) ئەویش وەڵام دەداتەوە : (من کارەکانم لە سەبکی ئیمپرسیۆنیسمدایە ) یالە سەبکی کلاسیسم یا لەریالیسم یا لە رومانتیسمدایە . هەروەها بەش بەحاڵی شاعیرێک یاچیرۆک نووسێکیشەوە هەرهەمان وەڵاممان ـ یەکێک لەم ئیستیلاحانە-گوێ لێ دەبێ ...فلان شاعیر سەبکی کلاسیکی گرتۆتەبەر... فیسار چیرۆک ـ نووس سەربە سەبکی ریالیزمە ...

ئەم سەبکانە چین ؟ دەڵێی هەر سەبکەی لەگەڵ ئەوەی دیکە جیاوازی هەیە! هەموو سەبک وڕێبازەکان تایبەت ونیشانەی خۆیان هەن !

ئەڵبەتە خوێنەر بۆئەوەی باشتر لە هونەر وئەدەب بگاوچێژی لێ وەرگرێ ،پێویستە لە هەموو لقێکی ئەدەب وهونەر وهەموو سەبک و ڕێبازێک تا رادەیەکی باش شارەزابێ و زەمینەیەکی پتەوی رۆشنبیری هەبێ ، بۆ ئەوەی بتوانێ لەسەری بوەستێ وسوود وتامو چێژ لەوکارە هونەری یە وەربگرێ .

لێرەدا هەوڵ دەدەین زۆربە کورتی ڕێبازی ڕۆمانتیک ،بۆخوێنەرانی خۆشەویستی (سروە) روون بکەینەوە ....بە ئومێدی ئەوەی کە خوێنەران خۆشیان لە ڕێگای سەرچاوەوکتێبەوە زیاتر ئاشنایەتی لەگەڵ نیشانەوخاسیەتەکانی ئەم ڕێبازە وڕێبازەکانی دیکەش پەیدا بکەن ولە ڕێگای لێ دوانەوە زیاتر بیناسن و سوودی لێ ببینن .

ڕۆمانتیک کە لە بنچینەدا وشەیەکی فەرەنسی یە ،مانای "چیرۆک ئاسا" ،"پاڵەوانەتی" "شاعیرانە" دەدا .لە ئینگلیسی شدا رۆمان هەربە مانای "چیرۆک"دێ و، ڕۆمانتیک بە مانای "خەیاڵی"و"ناسک هەستی" بەکاردێ . ڕۆمانتیسم ورۆمانسیەت ورۆمانتیک ورۆما ـ نتیکیەت ـ یش سەربە هەمان زاراوەن ،ناو و زاراوەی ئەو ڕێبازە هونەری وئەدەبی یە کەلە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمدا ، دژ بە ڕێبازی کلاسیک ،لە ئورووپا هاتەگۆڕێ وبلاو بۆوە ،پاشان لە ڕێگای تەرجەمەکردنی کتێبان ولەڕێگای ئەوپێوەندی یە شارستانی یەی کەئێمەی کورد بە ئورووپاوە دەبەستێتەوە کەوتە نێو ئێمەشەوە .

لەسەرەتادا بابزانین ئاخۆئەم ڕێبازە لە ئورووپادا بۆچی ولە چ حاڵ ووەزعێکدا سەری هەڵداوەتەوەی کرد؟ ونیشانە وسفەت و تایبەتی یە هونەری یەکانی چ بوون وچین ؟

پێشەکی دەبێ بزانین کەبە درێژایی سەدەکانی رابردوو ، ڕێبازی کلاسیک باڵی

بەسەر هونەر وئەدەبی میللەتانی ئورووپادا کێشا بوو، واتە هونەر وئەدەب بە پێی چەند قانوون وبنەمایەکی کۆنی هونەری دەخوڵقان . ئەم هونەر وئەدەبە، هەمیشە لە کۆشک و دیوەخانی بەگ وبەگزادان ،پێشکەش دەکرا و دەخوێندرایەوە .واتە پاوانی تاکە چینێکی کومەڵ بوو: چینی دەوڵەمەند ودەسەڵاتدار و "خانەدان"!وهەر بەتەنیا ئەوان مافی ئەوەیان هەبوو دەو هونەر وئەدەبە ، دەو جوانی یە ،بگەن وچێژی لێ ببینن .

لەسەردەمی کلاسیکدا ،خەڵک پەیوەندێکی پتەویان بە هونەر وئەدەبەوە نەبوو ،چونکە شاعیروهونەرمەندی کلاسیک پابەندی داب و رەسم وقانوون وزەوقی چینی دەربەگ بوون .

شاعیر وهونەرمەندی کلاسیک تەنیا باسی "جوانی" و"چاکی" یان دەکرد، خۆیان لە باسی "خەراپە" و"شتی دزێو وناشیرینی نێو کۆمەڵ "دەبوارد ورەخنەیان لێ نەدەگرت . هەمیشە لایەنی باوی سەپاو (قەراردادی) یان دەگرت .شیعرونووسین وتابلۆکانیان بەکەیفی بەگ وبەگزادان ،بەئارەزووی هاوچینەکانی خۆیان دەڕازاندەوە . نەدەبوایە لە سنووری بۆچوون وزەوقی ئەوان بچنە دەر وپێ لە بەرەی خۆیان زیاتر راکێشن! .شاعیروهونەرمە – ندی کلاسیک ، کاتێکی کە شیعرێک یا چیرۆکێک یا شانۆنامەیەکی دەنووسی یا تابلۆیەکی دەنەخشاند ،هەمیشە هێزی ئەقڵ و شتەباوەکانی دەردەبڕی وتەنێ شتە سەپاو و زانراوەکانی پێش چاو دەخست! هیچ نەهێنی و رازێکی دەروونی وهەست ونەستێکی فەردی دەرنەدەبڕی ،واتە لە هیچ ئازارو مەینەت و دەردێکی فەرد (تاکەکەس) نەدەدوا وەک لەو سەردەمەدا هیچ کەس بەکوێرەوەری نەژیا بێ و گیروگرفتی نەبووبێ! ،کۆمەڵی خەڵک تەنیا وەک بابەتی نووسین دەهاتە بەرچاوی نووسەر!

بەم جۆرە وەک رەخنەگرێکی ئێرانی دەڵێ : هونەرمەندی سەربە رێبازی کلاسیک ،هەمیشە چاوپۆشی لەفەرد دەکا ،بۆئەوەی گرۆیەک لە خەڵک یا چینێک پێشان بدا... ،تەنانەت ئەگەر لەخۆشی بدوێ ،لە کەسێک دواوە کە"خۆی " نیە، بەڵکوو کۆمەڵێک لە خەڵکە ،یاچینێکە یا "هەر ئینسانێکە!".

نیشانەی هونەری کلاسیک ئەوە بوو کە عیبارەت وتەعبیری بەگرێ وگۆڵ وئالۆزیان بەکار دەهێنا وشێوەودەستوورێکی هونەری وایان رەچاو دەکرد کە تەنیا بەگزادە و ئەنداما نی "روونا کبیر"ی خاوەن دەسەڵات تێی دەگەیشتن وچێژیان لێ دەدی ...

ئەم حاڵ و وەزعەی کۆمەڵ و هونەر بەدرێژایی سەدەکانی رابردوو هەر بەردەوام بوو تا گەیشتە سەدەی حەڤدە وسەرەتای سەدەی هەژدە ،واتە تا ئەوکاتەی کە رێبازی رۆمانتیک سەری هەڵدا

**رێبازی رۆمانتیک چۆن پەیدا بوو؟**

لەنیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەمدا چینی دەرەبەگ وبەگزادە ونەجیب زادەکان ،واتە ئەو چینەی دەستی بەسەر ئەدەب و هونەردا گرتبوو ،وردە وردە دەسەڵاتی سیاسی وئابووری خۆیان لەدەستدا ولەباری ئەخلاق وبیروباوەڕ ورەوشتیشەوە هەربەرەو گنخان وشپرزەبوون دەرۆیشتن وجلەوی رابواردنی خۆیان وەکوو جاران بەدەستەوە نەمابوو .ژیان گۆڕا بوو، ئالۆزتر بوو .گیروگرفت وکوێرەوەری زۆرتر و قوولتر بوو .لەلایەکی دیکەشەوە خەڵکی عەوام لە چەوسانەوە وکوێرەوەری وبێ بەشی خۆی وئەو زوڵم وزۆری یەی لێی دەکرا ،ئاگادار ببوونەو، وچاویان لەجاران زیاتر بە دنیا و دەوروبەری خۆیاندا دەگێڕا .خەڵک هاتبوونە سەر ئەورایەی کە پێویستە ئەوانیش چێژ لە ژیان ولەجوانی وله هونەر وئەدەب وەربگرن، پێویستە کومەلانی خەڵک لە کۆت وپێوەندی چەوسانەوە رزگاربن وهەموو ئینسانێک ئازاد بێ .

بڕوانە لاپەڕەی ٤٨

پــا یـــزه زوحـا کـــی ســه‌رمــا ولـه‌شکـری بێدا دی ها ت
وه‌ک دلـّـی مــن پــڕلــه‌گــه‌ردی حه‌سره‌ت وخه‌م بــوو ولاّت
ســه‌یــری بــا ڕه‌ش کــه بـه‌بێ ره‌حمی چه‌مه‌ن تــا لاّن ئه‌کا ت
بــه‌رگـی زه‌ردوســه‌وزی گـوڵ لـه‌مهه‌رده بۆئه‌وهه‌ردئه‌بات
چـا دری زه‌ڕریــن لــه‌ســه‌ر بـووکی بـــه‌ها ری لاده‌دا ت

*　　　*　　　*

ئـا هی حـه‌سره‌ت خیزوســه‌ردی گولّشه‌نی دلّ پــڕ لـه‌ده‌رد
بۆ شکـۆفـه‌ی جوا نه‌مه‌رگ وبۆ گولاّلـّه‌ی ســوورزه‌رد
بــوو بــه‌تــه‌م‌وه‌ک رۆلـّه مردوو که‌وته‌سه‌حرا وکێوو هه‌رد
ئا وی سا وی رۆشن وجا ری لـه‌دا خا بــوو بــه بـــه‌رد
بووکــی خـۆر لـه‌م شینـه‌دا غـه‌مگینـه‌ره‌ش پۆشی ئه‌کا ت

*　　　*　　　*

به‌رگی دا ری دا ڕنی سه‌رما یی پــا یــز چــڵ بــه چــڵ
دا غــی ره‌نــگ زه‌ردی به‌هێ که‌ی خۆش ئه‌بێ ده‌رچێ لـه‌دڵ
حه‌سره‌ته بۆ دولـبه‌را نی دلـّستــا ن وا چوونــه گـــڵ
جـا هیــلان لـه‌م وه‌زعه وێڵ وعـا قـلاّن مــا ت وخــه‌جــڵ
وا عــیزه ئـه‌م رۆژگا ره بۆکـه‌سێ گـوێی پێ بـدا ت

*　　　*　　　*

بێ به‌رو بـێ به‌رگ وتینوو سێــوو هه‌رمـێ وهـه‌نـــا ر
مینبـه‌ری قا لاّوه گـوێـزو پـه‌لـّک ونه‌و بیـدو چنـا ر
هـه‌ر قـڕه‌و وه‌یشوومـه‌یـه ئیمـڕۆ لـه‌سه‌حرا ژوورو‌خوا ر
بولـبولی بێ چا ره کـۆچـی کرد لـه سـه‌حنی لالـــه‌زا ر
بــا غ جێگــه‌ی پـۆلی گورگه ،گه‌للـه‌یی ئا هوو هــه‌لاّت

*　　　*　　　*

ئێسته سه‌حرا ییکی چۆڵ وخـه‌م فه‌زا یـــه لالـــه‌زا ر
مـه‌جلیســه بۆ ورچ و رێوی بۆ بــه‌راز و کــه‌متیــا ر
والــه‌بـا تــی تـا جی گول گولـّبون لـه‌سه‌ریه تا جی خــا ر
با یه‌خه‌ی خۆی دا دڕێ قومری به وێنـه‌ی شێت و هـــا ر
بۆو ره‌فیقا نه‌ی هه‌موو ئــا وا ره‌ن و وێلــّـی ولاّت

*　　　*　　　*

هه‌ر په‌نا به‌خوا لــه حه‌مله‌ی گێژه‌لـّووکه‌و زمهه‌ریــر
هه‌ر وه‌کوو حه‌جا جی یۆسف خـوێــن رژێنی جوا ن و پیــر
بوخت ونه‌سره‌ودێ ده‌کا سۆزی هه‌موو عــا لــه‌م ئـه‌سیــر
دا مه‌نی سه‌حـرا لــه‌گـوڵ خا لـّی وه‌کوو کیسـه‌ی فه‌قیــر
قه‌ت لـه دونیا دا گـولـّـی بێ زه‌حمه‌تی پا یز نـه‌هــا ت

*　　　*　　　*

وەک تیاتر وایە عەینەن گەردشی دونیایی دوون
عەهدی گوڵ رۆیی وەکوو بەرق وچووە پەردەی نەبوون
تۆ تەماشا کە لە جێی گوڵ داری گوڵ غەرقی دڕوون
گوێ ئەگەر بگری دەبیسی هەرکە ئێستەش بێستوون
شینی زەخم وزووخی جەرگی لەت لەتی فەرهاد ئەکات

*　　　*　　　*

بۆعەزاخوانی بە سەد دەرد وخەمی دڵ چوومە باغ
دیم بە جێی بولبول لە پۆپەی یاسەمەن وێستاوە زاغ
سێوو هەرمێ عاجز وسەرو وسنەوبەر بێ دەماغ
خۆخ وهەنجیرو هەنارم دی هەموو دڵ پڕلە داغ
بێ گەڵا ومیوە مردوو، مردوێکن بێ خەڵات

*　　　*　　　*

بادی سەردی وابە توندی هاتە جەولان و تەکان
دارەکانی بەرزو ئەستووری بەسەر یەکدا تەپان
وشک هەڵاتن پاکی سەوزەو پۆشیان بەرگی نەمان
ئادەمیش هەروا دەچێ، کاروان لە شوێنی کاروان
دێت ودەڕوا کەس خەیاڵی مانی بێ رۆین نەکات

*　　　*　　　*

ساڵ و رۆژی عومری تۆ رۆیی وەکوو ئاوی رەوان
وادەزانی هەر وەکوو خۆتی تەڕو تازە وجەوان
واکوت وپڕ قەددی راستت لار ئەبێ چەشنی کەوان
دیدە نابینا و گوێ کەڕ، تەن زەعیف و ناتەوان
پڕ لە ئێش و زەحمەتی پیری دەبێ سەرتا بە پات

*　　　*　　　*

تۆ تەسەوور وانەکەی بێژی لەمانە زیاتری
ساغی وجوانی بە قووەت هەر دەمینێ و نامری
ساعەتی عومرت ئەگەر هاتە مقامی ئاخری
سەهلە بێژم گیا، لە کایەک بێ دەس وبێ پاتری
تووشەیەک ئامادە فەرموو نەک ئەجەل مۆڵەت نەدات

*　　　*

نەوبەهاری عومری زاری، هەروەکوو گوڵ چوو بە با
رەونەق وخۆشی جەوانی تێپەڕی و رۆیی و نەما
گیان وتەن وێنەی هەدەف ئامادە بۆتیری بەڵا
پایزی پیری دەداهەر لەحزە ئیعلانی فەنا
هەی نەماوەختی بەقا، زوو کۆچ کە بۆماڵی بەقات

یەکەم ڕۆژەکانی مانگی ڕەزبەر بوو. کزەبای ساردی پایز بەرەبەرە جێگای بە سروەی نەرم وفێنک لێژ دەکرد شەختە لە دوورەوە هەڕەشەی لە دوایین پاشماوەکانی ژیانی بەهاری دەکرد. هەتیوی بێ نازی باب مردوو کزولاواز ولارەمل بیری لەداهاتووی نادیاری خۆی دەکردەوە. پایز بە هەموو ڕواڵەتی دزێوی خۆیەوە خۆی دەنواند. کوردگوتەنی لووتێکی بای دەهێنا ولووتێکی بۆران.

کۆچی دوایی مامۆستای نەمر "هێمن" بەهاری ئەمساڵی کوردستانی لێ کردین بەپایز. زمان وئەدەبی کوردی سەرەڕای تەمەنێکی دووروودرێژو پڕلە هەورازونشێو تازەکەوتبووە گەشانەوەوبابێکی پیر وبە ئەزموون دەستی گرتبوو. هێشتا لە دارە دارە دەرنەچووبوو کەجارێکی تر بە هەتیوی دەکەوتەوە بەرپەلاماری ڕەشەبا وشەختە. ساڵێک بەهارەکەی پایزبێ، دەبێ پایزەکەی چۆن پایزێک بێ؟

لەناکاو هەتاوی هیوا و ئومێد هەورەکانی دڕاو لە ئاسمانێکی گەش و سامالدا خۆی وەدەرخست. لەدایک بوونێکی تازە هەوری خەفەتی ڕەواندولەسەرەتای پایزدا مزگێنی نەورۆزی بۆهێناین.

یەکەم کۆنگرەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی لەشاری مەهاباد پێک هات. کۆڕێک لە مامۆستایان، کوردی زانان کورددۆستان وشارەزایانی زمان وفەرهەنگ وئەدەبی کوردی. کۆڕێک لەوانەی کە تامەزرۆی خزمەت بە زمان و فەرهەنگ وئەدەبی کوردین. کۆڕێکی گەرموخۆمانە کە دوور لە هەموو هەراوهۆریا وجەنجاڵێک مەسەلە بنچینەییەکانی ئێستای زمانەکەمانی خستەبەرباس و لێکۆڵینەوە وبڕیاری لەسەردان.

هەرچەند لەوەزعێکی وادا نەبووین کەهەل ومەرجی پێویست بۆبەشداری کردنی هەموو یاهەرنەبێ زوربەی زاناوخاوەن ڕاوکوردناس و کوردی زانەکانی دەرەوەی وڵات لەکۆنگرەدا پێک بێ و ئەوانەش کە بانگ هێشتن کرابوون هەموویان نەیانتوانی خۆبگەیەننە شوێنی پێک هاتنی کۆنگرەکە، بەڵام ئەوەندەی کە کۆوەبوون کۆڕێکی پسپۆڕ و خاوەن ڕایان لێ پێک دەهات. نوێنەرانی هەموو لەهجەکان وزوربەی بن لەهجەکان لە شیمالەوە تاجنووب، تەنانەت نوێنەری کوردەکانی خوراسان لەم کۆنگرەدا بەشدار بوون و براکوردەکانی ئەودیوی سنوور نوێنەریان بوو. مامۆستا کورددۆستەزمان ناسە غەیرە کوردەکان بەشداری یان کرد. بەکورتی کۆڕێکی پێک هاتوو لەشارەزاییوزانست ولەهجەی جۆراوجۆر، بەڵام هاودەنگ و هاوبیروڕا لەسەر مەسەلەیەک کەئەویش خزمەت بە زمان و ئەدەبی کوردی یە.

لەکومیسیۆنەکانی سەربە کۆنگرەدا، زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی، ڕێنووسی زمانی کوردی، کتێبی دەرسی پۆلی یەکەم بەزمانی کوردی نێوەرۆکی گۆواری سروە،

شێوەی کۆکردنەوە وناساندنی
وێنەوبەڵگە وکتێب وشوێنەوارو
گەنجینە هونەری وفەرهەنگی ـ
یەکان ،چۆنیەتی پێک هاتنی
کۆڕەزانستی یەکانی مێژوو
ناسان،جوغرافیازانان،قامووس
نووسان ، ئەدیبان و
هونەرمەندان و... خرانە
بەرباس .چ لە کومیسیۆنەکاندا
وچ لە بەرنامەی وتارە
ئازادەکانی کۆنگرەدا. هەموو
بەشدارانی کۆنگرە بەبێ ترس
لەوەی بیروراکانیان ببێتە
هۆی دڵیشان یاتووڕەیی و
رق هەستانی ئەندامێکی تر ،
بیروباوەڕی خۆیان دەردەبڕی
وتەنانەت جاری وابوو کێشەی
زۆر توندیش بەرپادەکرا .بەڵام
کێشەکە کێشەی بۆچوون وبیرورا
بوو نەوەک رقەبەری وخۆنوا ـ
ندن .کەوابوو بە روون
کردنەوەیەکی کورت وبەکەڵک
ئاوبەسەرئاگردا دەکرا و
بیرورا جیاوازەکان زۆر زوو
یەکیان دەگرتەوە .

لەلایەن حکوومەتە زۆردارە
تاغووتی یەکانەوە جگە لە
دەردو مەینەت ودەستدرێژی
هیچ دیاری یەکی تر بەگەلی
موسڵمان وبەشخوراوی کورد
نەگەیشتووە . لەبەشەکانی
دیکەی کوردستاندا تەنانەت
حاشا لە بوونیشی دەکرێ .
هەرکات ئەم گەلە ویستوویە
بەمافی رەوای ئینسانی خۆی
بگا ،یاراستەوخۆ سەرکوت
کراوە یابۆلەڕی هەتڵەکردنی
لەنێوخۆیدا هۆرەی بۆساز
کراوە . ئێستابۆیەکەم جارە
کە نەتەوەکەمان لەئێرانی
ئیسلامیدا خۆی دەناسێتەوە .

هەراو هوریای تەبلیغاتی
هێزەئیستیعماری یە
بێگانەکان هیچ ئامانج و
مەبەستێکی نیە جگە لەوەی
راستی یەکان بەراوەژوونیشان
بدا وبۆ پاراستنی هەرچی
زیاتری بەرژەوەندی خۆیان
سنوورێک لەنێوان دۆستان و
دوژمنانی گەلەبەشخوراوەکاندا
نەهێڵێ وریزەکانیان تێکەڵ
بکا ،دۆست وەکدوژمن ودوژمن وەک
دۆست بنوێنن .راست ئەم
سیاسەتەش لەبەرانبەر گەلی
کورد وکۆماری ئیسلامی
ئێراندا رەچاوکراوە.
تەبلیغات وبانگەشەی دوژمن
هەوڵی دەدا ئەم باوەڕە لە
نێوکومەڵدا بڵاو بکاتەوە کە
کۆماری ئیسلامی ئێرانیش
وەک رێژیمەکانی دیکەی ئەو
وڵاتانەی کە کوردیان تێدا
دەژی ،دژبەگەلی کوردەو
تەنانەت زیاتر لەوەش هەوڵ
دەدەن رێژیمە رەگەزپەرەستە ـ
کانی وڵاتانی دەوروبەر بە
دۆست وکۆماری ئیسلامی ئێران
بەدوژمنی گەلی کورد بناسێنن
هەروەها تێدەکۆشن بە
خەڵکی بسەلمێنن کەتا نیزامی
ئیسلامی زیاتر سەقام بگرێ
مافەرەواکانی گەلی کورد
زیاتر پێ شێل دەکرێ .

ئەوهەنگاوانەی تا ئێستا
لەلایەن کۆماری ئیسلامی
ئێرانەوە بۆپەرەدان بەزمان
وفەرهەنگ وئەدەبی کوردی
هەڵگیراون ،بەتایبەتی
پێک هاتنی کۆنگرەبۆ پووچەڵ
کردنەوەی تەبلیغاتی دوژمن
بەسە .پەیامی سەرۆک وەزیری
کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ
کۆنگرە ئەم هیوایەی لەدڵی
گەلەکەماندا بەتینتر کرد کە
دەوڵەت بەپێڕەوی لەقورئان و
ئیسلام بۆ نەهێشتنی هەرچەشنە
بێ بەشی وتەبعیزێک لە ناوچە
کوردنشینەکاندا هەنگاو
هەڵدێنێ .خزمەت بە زمان و
فەرهەنگ وئەدەبی کوردی و
سازکردنی ئیمکانات و
کەرستەی پێویست بۆپەرە
پێ دانی ،هەروەها هان دان و
دڵگەرمکردنی لاوەدڵسۆزە
ئەدەبدۆستەکان ،کە هیوای
دوارۆژی گەلەکەمانن، لەم
رێگایەدا بەشێک لەو هەنگاوە
بەکەڵکانەن .

ئێستاش دەرەتانێکی وا
پێک هاتووە تاهەر ئەدەبدۆ ـ
ستێک ئازادانە وئازایانە
بەبێ ترس لەو داوەڵانەی
لەبیرو خەیاڵیاندا سازکراوە
وبەبێ پرینگانەوە لە هەر
تەوس وتوانجێک باسکی
هیممەت هەڵماڵێ ولەم مەیدانە
بەرفراوانەدا خزمەت بە
زمانەکەی بکا .ئینتیشاراتی
سەلاحەددینی ئەییووبی کە
ئەرکی پێک هێنانی کۆنگرەی
لەسەرشان بوو هەروەک لە

درێژەی تێکۆشانی خۆیدا توانیویەتی سەرنجی بەشێکی زۆر لەزاناوئەدیبەکان و لاوەهونەردۆستەکان بۆلای خۆی رابکێشێ، ئێستاش چاوی لە یارمەتی فیکری وهاوکاری هەموولایەنەی ئێوەیە.

سروە وەک یەکەم بەرهەمی ئەم هاوکاری یە گشتی یە نیازی بەخزمەتێکی زیاترە. رێگابۆ خزمەت لەم زەمینەدا زۆر پان وبەرینە. ئێوە دەتوانن بەپێی شارەزایی و لێ زانی خۆتان بۆبردنەسەری پلەی زانستی گۆوارەکە هەنگاو هەڵێننەوە. خوێنەری ئێستای گۆواری کوردی تەنیا بەوەندە رازی نیە، گۆوارەکەی کوردی بێ جا هەرچی تێدا نووسرابێ. نێوەرۆکێکی پڕبایەخ وبەکەلک، باسی بابەتەزانستی یە جۆربە جۆرەکان، باسی ئەوبابەتانەی کەلەژیانی رۆژانەماندا لە گەڵیان بەرەورووی دەبین. روون کردنەوە ولێکۆڵینەوەی دابەنا حەزە کۆمەڵایەتی یەکان ودۆزینەوەی رێگاچارەیان، ناساندنی شاعیر وئەدیب و زاناوهونەرمەندانی کورد، چ ئەوانەی ناسراون ودەبێ باشتر بناسێندرێن، چ ئەوانەی تا ئێستا نەناسراون وناساندنیان پڕسوودە. ناساندنی ئاسار وگەنجینە ئەدەبی وفەرهەنگی وهونەری-یەکان ودەیان بابەتی دیکە وێڕای ئەوبابەتانەی کە تائێستا لەسروەدا بڵاو کراونەتەوە، کولێ دڵی خوێنەری کورد دادەمرکێنن.

چ لەکومیسیۆنی تایبەتی لێکۆڵینەوەی نێوەرۆکی "سروە"دا وچ لە کۆبوونەوەی گشتی کۆنگرەدا رەخنە و پێشنیاری زۆرجوان وبەکەلک راگەیەندران. هەموویان رێ پێشاندەر بوون. هیواداریین بەکەلک وەرگرتن لەوپێشنیا-رانە هەتادێ نێوەرۆکی "سروە" رازاوەتر وپرسوودتر بێ. ئەڵبەتە تەنیا پێشنیاردانیش چارەساز نیە بەڵکوو نووسینی بابەتی بەکەلک وناردنی بۆ "سروە" رێگاچارەی ئەم کەم و کووڕی یانەیە.

بەرنامە بۆپەرەدان بە مەیدانی تێکۆشانی "سروە" زۆرە. دەکرێ ماوەی بڵاوکردنەوەی گۆوارەکە لە سێ مانگ جارێکەوە ببێتە مانگانە و هەفتانە، دەکرێ لەگەڵ هەر ژمارەیەکی "سروە"دا پاشکۆیەکی تایبەتی لەسەر بابەتێکی دیاری کراو وەک پاشکۆی هونەری، پاشکۆی تایبەت بەباسەئابووری یەکان پاشکۆی تایبەت بە مەسەلە کۆمەڵایەتی یەکان و ........ بڵاوبکرێتەوە. دیارە زۆر نووسراوی درێژ هەن کە بڵاوکردنەوەیان لە "سروە"دا ناگونجێ بەڵام بۆپاشکۆی تایبەتی بەکەڵکن. دەکرێ جگە لە گۆواری ئەدەبی و فەرهەنگی "سروە" چەند گۆواری تایبەتی دیکەش هەفتەی جارێک یا مانگی جارێک بڵاوبکرێنەوە، وەک: "سروەی لادێ" بۆباس کردن لەسەر گیروگرفتەکانی ژیانی لادێ وکشت وکاڵ و ..."سروەی ژنان" بۆباس کردن لەسەر مافەکانی ژن لە کۆمەڵدا، ئەرکی ژنان لە کۆمەڵدا، نەخشی ژنان لە کۆمەڵدا. رێنوێنی ژنان بۆکاری نێوماڵ وبەخێوکردن وبارهێنانی منداڵ و ..."سروەی خوێندکاران و ..." دەکرێ وەک پێشتریش باسی کراوە کتێب ونامیلکەی تایبەتی بۆ"هونەری لاوان"بڵاو بکرێتەوە کەپێک هاتوویەک بێ لەوێنە وشیعروچیرۆک و نووسراوەی لاوەهونەرمەندەکان گۆواری سروە چاوەڕوانە کە زیاترلە جارانی یاریدەبدەن تابتوانێ هەموو ئەم بەرنامانە جێ بەجێ بکاوبەرهەمێکی جوانتر ورێک وپێک تر لەجاران پێشکەش بکا.

دیارە جێگای بەتاڵی خوالێ خۆشبوو مامۆستاهێمن بەتاڵایی یەکی وانیە کە بەم زووانە پڕببێتەوە بەڵام ئەگەر هەرکام بەتەنێ ئەم کارەمان پێ ناکرێ بە هەموومانەوە شتێکمان هەرپێ دەکرێ.

# گازنده

پەرویزێ خەلیل «هیڤی»

ئەز کچەک کوردم، کوردستانیمە
ل وەلاتێ خۆ ئەز هەلاتیمە

دوژمن دەرکرم ژ مال و وارا
مامە بە لەنگاز، ل بەر دیوارا

ل وەلاتێ دەر ب کول و کەسەر
خەریب و بێکەس بوومە دەربەدەر

بۆ بژیوا رۆژ ئەز بوومە پالە
پالەتی یا نیڤ حەق دەرڤە ل مالە

ئەز دچم چۆلێ ناڤ چل و چیا
جل شڕ و پێخاس ل ناڤ دری یا

ل سبێدا زوو حەتا ئێڤارا
ل ناڤ دڕی و تووميێد قیفارا

دخەبتم ئەز بدەست و چۆکا
د ناڤ زەڤی و مەزرایێ نۆکا

ل بەر تاڤا گەرم نۆکا دچنم
یان دخەبتم ناڤ زەڤیێد گەنم

ئەڤ دەستێد نازک ،پەنجێد کاغەزین
قەلشین ، دڕین ، تەڤ بوونە برین

خوونا ڤان دەستا ل سەر سوورەتێم
بوویە سۆراڤ و رەنگێ رووومەتێم

بەژن و بالا من خار و چەمیایە
پشت بوویە کۆمک کەمەر تەویایە

تیرا تاڤا داغ رووومەتێم سۆتی
گولیێد منە زەر بوونە زۆر کۆتی

ل سەر سەرێ من رووونشتی گەمار
ل ناڤ خولیێدا مامە ئەزا ژار

گەمارا نۆکا بوویە کلێ من
خیزا سنجری کەلاند دلێ من

ڤەخارنا من گراڤیێد گەنی
سەرچاڤێم رەشە هەروەکی تەنی

قووتێ منا رووت ئەزا خودان شەرم
نانێ ترسیيە دگەل ئاڤا گەرم

زەندێ بێبازن بوونە قلێرین
تلیێد بێگوستیل رەش و قەرچمین

رەنگێ منە گەش بوویە رەش و هەش
چلمسین جوتێ چاڤێد رەش و گەش

گەرما هاوینێ ب کەل و تینە
دلێ م ژارێ زۆر دکەلینە

لێ گەلۆ کەنگێ ئەزێ رزگار بم
ل نیشتماندا بجی و وار بم

کێ هەیە بێتن هاواری یا من
م رزگار بکە ل زولما دوژمن

# لەگوندی ئێمە...
# رەنگە لە گوندی ئێوەش...

**داوەتێک دەگەڕێ وەرە ببینە**
**دوو کەسی تێدان دڵیان خەمگینە**
**یەکیان بووکە شەم یەکیان شەمزینە**

. لێرە خەڵک هەموو خزموناسیاون،سارد و گەرمی رۆژگار لێکی نزیک کردوونەوە تا لە تەنگانەدا پشت و پەنای یەک بن.

کاک مەحموود ماڵی لە خوار ماڵی ئێمە بوو. پیری و ئیختیاری برستی لێ بڕیبوو نەیدەتوانی کار بکا."مێرێ"ی کچی پار ئەم دەمانە دابووە کوڕی برایمە رووتی و خۆی و خێزانی و شوانەی کوڕی مابوونەوە.

شوانە خەرجی ماڵی کەوتبووە سەرشان،لە مەلا بانگدانانەوە تا ماڵ نوستنان لەسەر پەڵە زەوییەکەیان کاری دەکرد و جارجارەش یارمەتی دەر وجیرانی دەدا .بە هەڵکەوت بۆ خەڵکیش دەچوو تا ماڵ هەڵسووڕێنێ.

خەڵک شوانەیان خۆش دەویست، کوڕێکی باش و راست و داوێن پاک بوو ،خوشکی شوانە ئەگەر دەرفەتی بوایە خۆی دەگەیاندە ماڵە بابی و کاری ماڵی بۆ دەکردن.وەختی بژار و دەسکەنە و رنینەوەش دەچووە هاری(١) کاکی.

مێرێ شوانەی زۆر خۆش دەویست ،زۆرجاران کە لە ماڵێ بەتەنێ بەجێ دەما بیری لە زەحمەت و چەرمەسەری شوانە دەکردەوە و بۆی دەگریا.

هەرلەبیری ئەوەدابوو شوانە ژن بێنێ و پیرە دابکی بحەسێتەوە بەڵام ئەو ملی نەدەدا .

رۆژێک مێرێ بۆ کاکی چووبووە باقلە رنینەوە .چای ئێوارەشی ساز کردبوو ، هەرای شوانەی کرد:

ـ کاکە! چا حازرە! وەرە چایەکی فەریک بخۆوە با ماندووت بحەسێتەوە.

ـ رووت سپی بێ خوشکم ئەوە هاتم.

ـ لەنێو تۆز و خۆڵ و گەرمادا چایەک "کاورەمێیەکی دێنێ"! کاکە ماندوو نەبی.

ـ بەختەوەر بی خوشکم!

ـ ماڵت خرا نەبێ کاکە! هەتا کەنگێ هەر بەتەنێ دەبی؟

ـ چ بکەم مێرێ؟

ـ کوڕە ماڵتە دایکم پیرە و پێڕاناگا یەکی دەوێ یاریدەی بدا .ئاخر من خۆ هەتا هەتایە ناتوانم یاریدەی بدەم. بەتەنێش کاری پێ ناکرێ....دوێنێ بابم دەیگوت:

ـ ئەوەندە نەمردووم مندالی شوانەشم دیوە.

ـ ئاخر بە چی ژن بێنم خوشکێ؟

ـ لە قەدیمەوە گوتوویانە "ئیمامی عەلی زامنی ژن هێنانە".

ـ نازانم چ بکەم؟....

ئەوەندی گوت ومات بوو ،هەناسەیەکی هەڵکێشا بۆ کرووزی لێدەهات .ماوەیەک بوو " شەمێ"ی کاخدری خۆش دەویست ،بەڵام دەترسا نەیدەنێ.بەردێکی لەسەر دانا بوو. لای کەس نەیدرکاندبوو.هۆی دەست راگرتنیشی هەر ئەوە بوو.شەمێ کیژۆڵەیەکی جوان و نەشمیل و رەزاسووک بوو ،شەرم و

حەیای لە تاریف نەدەهات .

ئێواران دەستی دەدا جەرەسوور وبە بەر دەرگای ماڵی شوانەدا بۆ کانی دەچوو شوانە دەیدی و دڵی بۆی دەیکورکاند...... سەری هەڵێنا چاوێکی لە مێرێ کرد . بە دەرفەتی زانی ئەم رازە لە لای خوشکی بڵێ و پرێسکەی دڵی لای ئەو بکاتەوە .گوتی:

ـ مێرێ! خوشکێ گیان! ژن نەهێنانی من دوو هۆی هەیە .یەکیان ئەوەیە کە ئەوەی من خۆشم دەوێ بۆخۆی نازانێ یەکەو دوای وەش دەستم کورتە .

مێرێ کە وردە وردە بە ئاوات دەگەیی هێندێکیتر نزیک بووە و گوتی:

ـ کاکە خەمی پووڵت نەبێ خودا گەورەیە بەڵام بڵێ کێیە؟

شوانە بێئەوە هیچ بڵێ چاوێکی لە ئاوایی کرد و سەری داخست.مێرێ شکی بۆ شەمێ دەچوو .هەر ئەویشی قابیل بە کاکیدەزانی بەڵام بۆ ئەوە قسەکەی وەراست بگەرێ گوتی :

ـ کاکە شەمێت خۆش دەوی؟

شوانە بە بیستنی ناوی شەمی راچەنی . سوور هەڵگەرا .مێرێ گوتی:

ـ خەمت نەبێ! ئێوارە لە کانی بۆت پێ دەڵێم .خەمت نەبێ...هەر جۆرێکی بێ رازی دەکەم.

ئەودەم کە خۆرەتاوی لارەمل بە ئەسپایی بەرەو باوەشی کێوەکانی رۆژئاوا دەخوشی، ماڵ ئاوایی لە لک وپۆ بەرزەکانی دارستانی ئاوایی دەکرد مێرێ بەرەوکانی داگەرا .پاش تاوێک شەمێ پەیدا بوو ، دانیشتن دەستیان بە قسە کرد ، هێندێکیان قەراغ تێک کردەوە و دوایە مێرێ بە تەقیە شەمێی لە رووداوەکە ئاگادار کرد . شەمێ نەیدەتوانی جواب بداتەوە .شەرمی دەکرد لێوی دەگەست، بەڵام مێرێ سات بە سات سوورتر دەبوو. شەمێ ناچار بوو وڵامی بداتەوە . بەشەرمەوە گوتی :

ـ بابم دەزانێ....من دەسەڵاتم نیە .

مێرێ دەیزانی ئەو وەلامەنیشانەی رازی بوونە ، ئاخر شەمێش عاشقی پیاوەتی و ئازایەتی و دەنگ خۆشی شوانە بوو ،بەڵام نەیدەوێرا هیچ بڵێ. لە خودای دەویست یەکێک وەک مێرێ لێی بپرسێ.مێرێ شاگەشکە بوو .بە پەلە گۆزەکەی پڕ کرد و بەرەو ماڵ بۆوە . تا ئەو خەبەرە خۆشە بە شوانە بدا ...

مزگێنی رازی بوونی شەمێی بە شوانەدا و هەموو شتێکی لە بنیاتەوە بۆ گێراوە . شوانە تەنیا ئەوەندەی گوت :

ـ دەی ئەوجار چ بکەین ؟

ـ بەیانی ولام لە ماڵە کاخدری دەنێرین و کار تەواوە .

* * * *

باوکی شوانە بە کۆمەکۆم وەپێش دوو سێ کەیخودا کەوت و چوونە ماڵی کاخدر.

پاش بەخێر هاتن لە دەغڵ ودان و حاسڵی ساڵێ را پێدا هاتن، تا کاک هەمزە رووپەرەکەی وەرگێرا و خوازبێنی بۆ شوانە کرد .باوکی شوانەش بە ردێنی سپییەوە رووی لە کاخدر نا .

خدر پیاوێکی توورە و تۆسن و بێبەزە بوو ، لەگەڵ ئەوەشدا کچی بە دیل دەزانی و ئاخاوتنی لەگەڵ کچ پێ شوورەیی بوو . ماوەیەک بوو سێ چوارێکی قۆشمەی خراپ هات و چۆیان دەکرد یەکیان حەمە سووری قاچاخچی بوو .خەڵک دەیانزانی حەمەسوور تریاکی دەفرۆشێ.پیاوێکی لۆتی و خراب بوو ، ژنی بەلاوە گیر نەدەبوو .چوار ژنی هێنابوو سێی تەلاق دابوون.کاخدر هێندەی دی لەگەڵ ئەمجۆرە پیاوانە گۆڕابوو .بەڵامئێستا نەیدەتوانی قسەی کاک مەحموودی باوکی شوانە و کاک هەمزە بشکێنێ،بۆیە وەقسە هات و گوتی:

- شەمێ چیە؟ بۆ قسان ناکەی؟

شەمێ سەری هەڵێنا چاوە پڕ فرمێسکەکانی لە مێرێ بڕی دوایە ویستی زاری هەڵبڕێ و هەموو شتێک بڵێ بەڵام سەری بەرداوە و بێدەنگ بوو.

مێرێ بیری لە پێک بڕانی شەمێ و شوانە دەکردەوە وایزانی بیری شەمێ ئاڵۆزە و حاڵی نەبووە دیسان دووپاتی کردەوە؛

- شەمێ،دەزانی چمگوت؟ شوانە پوولی پەیدا کردووە هێندێکیش خاڵم دەستی گرتووە دیسان دەنێرێتە سەرت، بابت رازی دەکا. دڵی نەرم دەکا .تۆ دەدا بە شوانە ،شەمێ دڵنیام ئەوجار دەتدا ....دڵنیام.

شەمێ ئەوجار لە قوڵپەی گریانیدا ....

مێرێ سەری سوورمابوو .گوتی:

- قسان بکە شەمێ...قسە...

شەمێ وەقسە هات .بەڵام دەتگوت دەنگی نەخۆشێکی بناوبوێرە.....

- مێرێ.....دە...زانی چیە !...

شوانە لە دوورەوە دەنگی دەهات تێی هەڵکردبوێە. بە بیستنی دەنگی شوانە هەر دووک بێدەنگ بوون.

**ئەی لە زاڵم**
**کیژ دەڵێ یارەبی خودایە**
**هەرچی دەبێتە باعیسی دوو دڵان**
**خێر لە ماڵ و مەنزڵی خۆی نەبینێ**
**ئاخری ساڵێ رەنج بەخەسار بێ**
**وەی زاڵم نەمێنی**

مێرێ چاوێکی لە شەمێ کرد و گوتی:

- دەی ...

- دەی چی؟...من ...منیان لە حەمەسوور ....نەیتوانی درێژە بە قسەکەی بدا و دەستی لە ئەستۆی مێرێ کرد و لە قوڵپەی گریانیان دا.

* * * *

گریانی ئەم دوو کۆترە باڵ شکاوە دەوڵات دەگەڕا....دەرۆیی بەرەو ژوور... بەرەو ئاسمان....فرشتە پاکەکانی خوا ئەم کرووزانەوەیان دەبیست و دەهەژان....

**داوەتێک دەگەڕێ وەرە ببینە**
**دوو کەسی تێدان دڵیان خەمگینە**
**یەکیان بووکە شەم یەکیان شەمزینە....**

* * * *

هەموو رۆژێ بانگی شێوان کە تاریکی شەو لەسەرە خۆ بەسەر وڵات دەکشا و هات و هاواری رۆژ دادەمرکا ،عیفریتی خەم هێرشی دەبردە سەر دڵ شکاوەکان.

شوانە دەستی لە کار دەکێشاوە لەسەر تەختە بەردێکی دادەنیشت .بیری لە دڵی شکاو و ئاواتی بابردووی دەکردەوە..تێر تێر دەیڕوانییە ماڵی شەمێ دوایەدەیگوت:

**خودایە بێتوو باڵی کۆترێک بشکێنن..... هێلانەیەک بڕووخێنن، جزیایان دەدەی ئەدی ئەگەر دڵی مەزلوومێک بشکێنن و فوو بە چرای هیوا و هومێدی دڵێک دابکەن و زوڵم لە بەندەیەکی بێتاوانت بکەن چیان لێدەکەی؟**

هێندێک رادەما و دوایە تێی هەڵدەکردێ

**داوەتێک دەگەڕێ وەرە ببینە**
**دوو کەسی تێدان دڵیان خەمگینە**
**یەکیان بووکە شەم یەکیان شەمزینە**
**شەم دەڵێ بە دڵێ خۆ ناکەم**
**دەگری و کەوتەڕکان**
**سەت سوارم بۆ بێ میری باڵەکان**
**بە شوانەی نابێ مەر لە کێلەکان**
**بە دڵێ خۆ ناکەم لە گرین و رۆیە**
**سەت سوارم بۆ بێ میری شنۆیە**
**بە شوانەی نابێ مەر لەدم جۆیە**
**بە دڵێ خۆ ناکەم دەگری و دەنووکێ**
**سەت سوارم بۆ بێ میری کەرکووکێ**
**بە شوانەی نابێ مەڕ لە مێمووکێ.....**

دەنگێکی ئاشنابوو....ناڵەیەکی بەسۆ بوو ئیتر گوندی ئێمە بە شوانەیان دەگوت: مەجنوون....

ـ شوانە چاوی منە ، کوڕێکی باش و بەکار و ڕەشیدە .خودا هەڵناگرێ چی خراپم پێوە نەدیوە خزمایەتی لەگەڵ پیاوی وەک مام مەحموودیش بەجێی خۆی جێی شانازییە . بەڵام هەموو دەزانن دایکی شەمێ پار ئەمری خودای کرد و شەمێ بنەوانمانە .ئەگەر ئەو بە مێرد بدەمماڵەکەم دەشێوێ. ئاخر دەبێ یەکێک بێ بنەوانیمان بکا .ڕاستییەکەی ئەوەیە دەمەوێ شەمێ بەژن بدەم......

شەمێ لەپشت دەرگا لە پاشخانە گوێی هەڵخستبوو. بە قسەی بابی تێک چوو ،ئەگەر دەسەڵاتی بوایە وەژوور دەکەوت و دەیگوت : " نا ...نا ..من بەژن ناچم" بەڵام نەیوێرا چون دەیزانی پاش ڕۆیشتنی میوانان باوکی لە تەویلە لە کۆڵەکەی دەبەست و بە خەرەزەنان وەری دەگەڕایە ،بە تاوانی ئەوە کە بەر لەوە بابی ئاگادار بێ بەڵێنی شوو کردنی داوە.

جوابی خدر لە دڵی میوانان گران هات مام مەحموود کەزۆر بە پەرۆش بوو لێوە چرچەکانی دەلەرزین.گوتی:

ـ ئاخر کاخدر بابم ماشەڵڵا خۆ بێدەستەنی کوڕت هەیە ژنی بۆ بخوازە .دوو کچی دیکەشت هەن.چ خودا بەردارە دڵی شوانە دەشکێنێ .ئەگەر ژنیشت بۆ خۆت دەوێ بنێرە سەر کەسێکی و بیخوازە ،خودا سەلامەتت کا ! خۆ ئەو خوشکی نیە بیدا بەتۆ برالە خودا هەڵناگرێ....

بەڵام دڵی وەک بەردی خدر ئەوانەی نەدەسطماندنەیدەتوانی پێ لە عەیبەکانی بنێ لە بیانوویەک دەگەڕا .دەستی بە سمێڵاندا هێنا و گوتی:

ـ برالە ،سێ چوار ڕۆژم مۆڵەت بدەن بۆ خۆم وڵامتان لێ دەنێرم....

* * * *

ماوەیەک رابرد کاخدر شەمێی دەماڵی کوولی کرد بوو. شەو و ڕۆژ یا لێی دەدا یا لاتاوی پیدا دەدا .نەیدەهێشت لە ماڵ وەدەر کەوێ.لەو ماوەدا لەگەڵ حەمەسوور کەینەوبەینەی خۆیان کردبوو .شەمێی دابوو بە حەمەسوور و خەجە سووری خوشکی حەمەی لەخۆی مارە کرد بوو .ئەوجار کە کار لە کار ترازا شەمێ دەیتوانی لەماڵ وەدەر بکەوێ.ئێواران وردە وردە دەچووە سەر قەبران.دەستی دە کێلی قەبری دایکی وەردێنا و دەستی دەکرد بە گریان.شوانەش لە دوورەوە تێی هەڵدەڕوانی و بە دەنگی بەسۆزی تێی هەڵدەکردێ :

**ئەی لە زاڵم**
**کیژ دەڵێ یارەبی خودایە**
**هەرچی دەبێتە باعیسی دوو دڵان**
**خێر لە ماڵ و مەنزەڵی خۆی نەبینێ**
**ئاخری ساڵێ ڕەنج بە خەسار بێ**
**وەی زاڵم نەمێنی.....**

منداڵەکانی خدری وەدایکیان دەچوون.ڕووح سووک و جوان و بەحەیا دایکی شەمێ بە مرد وویش هاورازی دڵی شکاوی شەمێ بوو...

شوانە بەو حەیس وبەیسەی نە زانیبوو کە شەمێ ژن بە ژنەی پێ کراوە حاسڵی ساڵێ و مانگایەکی ئەستێرو هێوەرەیەکی بردە بازار، فرۆشتی، تا بەڵکوو بە پووڵی ئەوان بتوانێ کاخدر رازی بکا و شەمێ بخوازێ.لە بازار گەڕاوە بە پەلە بۆلای ماڵی خوشکی چوو تا بچێ و ئەو مزگێنییە خۆشە بدا بە شەمێ .

مێرێ ئێوارە لە پشت دێ لەسەر قەبران شەمێی دی بۆی گێڕاوە .شەمێ مات بوو .خەم لە چاوی دەباری.کوڵی گریانی دە ئەوکی مابوو قسەی نەدەکرد.

# محەمەد سەدیقی مفتی زادە

ناوچەی سنە بێ گومان یەکێکە لە گەورەترین ناوەندەکانی فەرهەنگ و ئەدەبی کورد کەلە ئامێزی خۆیدا سەتان شاعیرونووسەر وفیلسۆف وزانای بێ وێنەی پەروەردە کردووە. لێرەشدا بەداخەوە هەروەک هەموو ناوچەکانی تری کوردستان تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی پان و بەرین کە هەموو لایەن و سووچ وقوژبنی فەرهەنگەکەمان بگرێتەوە ،نەکراوە وئاگادار- یمان لەژیان وبەسەرهاتی زانایانی سنەودەورو بەری زۆر کەمە .هیوادارین زانایانی ئەوڕۆی ئەم ناوچەیە تائەو جێگایەی دەتوانن لەم بارەدا یارمەتیمان بدەن. لێرەدا سەرگوریشتەی زانای بەناوبانگ دوکتۆر محەمەد سەدیقی مفتیزادە کە بە قەڵەمی خۆی نووسراوە و لە لایەن مامۆستا هەژارەوە بۆمان هاتووە ،بڵاودەکەینەوە :

* * *

ناوم محەمەدسەدیق ناوی بنەماڵەییم مفتی زادەیە لەساڵی ١٣٠٠ی کۆچی هەتاوی لەگوندی "دشە"لەناوچەی هەورامانی جوانڕۆ هاتوومەتە دنیاوە.

باوکم مەلاعەبدوڵڵای "مفتی" کوڕی"مەلا مەحموود" کوڕی "مەلامحەممەد"کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورە لەبنەماڵەی مەلایانی "دشە"یە.

دایکم کچی سەیید"شەهابەدین"ی تاڵشی ودایکی کچی شێخ "عوسمان"ی تەوێڵەیی هەورامانە.

لەسالانی پێش شەڕی جیهانی یەکەم باوکم لە لایەن فەرمانڕەواکانی ئەردەڵانەوە دەعوەتکراوە بۆشاری "سنە" وبووە بەموودەریسی خوێنگەی مزگەوتی "دارول ئیحسان" پاش چەن ساڵ، لە رۆژگاری فەرمانڕەوایەتی قاجارییەکان ـ دا دەعوەتکراوە بۆتاران ولەقەبی "مفتی کوردستان" ی، پێ دراوە وگەڕاوەتەوە بۆ شاری سنە .

تەمەنم شەش ساڵ بووە باوکم لەشاری سنە کۆچی دوایی کردووە .دایکیشم پێنج ساڵ پاش کۆچی دوایی باوکم لە "دشە" لەدنیا دەرچووە.

خوێندنی سەرەتاییم لە گوندەکانی :دشە وخانەگا و شاری سنە دوایی هێناوە. لە ساڵی ١٣١٥ی کۆچی هەتاوی دەستم کردووە بە خوێندنی عولوومی ئیسلامی و لە خزمەتی زانایانی ئایینی مەڵبەندگەلی شارەزوور،مەریوان، موکریان وشارگەلی :پێنجوێن سلێمانی ،کەرکووک ،هەولێر رەواندز ،مەهابادوسنە دەوسم خوێندووە.

ئەوزانایانە کە لە

خزمەتیاندا دەرسم خوێندووە ئەمانەن :کاکم حاجی مەلا خالیدی مفتی ،مەلا سەیید عارف ،مەلا سالحی،"تریفە" سەییدبابا رەسوولی "عەباسا بەیلی"لە مەلبەندی شارەزوور، مەلاباقری بالک ،مەلامەحموودی "دەرەتفێ"لە مەریوان، مەلا عەلی "حەمامیان" ، مەلا شێخ محەممەدی "بورهان" لە موکریان ،مەلاعارفی بانەیی مەلاسەییدعەلی لە"پێنجوێن" مەلامستەفای خاجی، مەلا رەسوول ،مەلاعەبدولای بێژوێی لەسلێمانی ،مەلا عەزیزی شلی خانەیی لە کەرکووک،مەلا سالحی دیبەگەیی ،مەلا ئەبووبەکر ئەفەندی لەهەولێر مەلاعەبدو لکەریم ئەفەندی لە رەواندز ،مەلاسەدیقی سەدیقی مەلا حسینی مەجدی لە مەهاباد مەلامەحموودی مفتی کاکم لە شاری سنەکە ئیجازەی عیلمیم بەلای ئەوەوە وەرگرتووە ولە دواییدا لەشاری سلێمانی ماموستایانی هەیئەتی زانیاری ئایینی ئەوقاف پاش تاقی کردنەوە ،ئەوئیجازە نامەیان بوّم موّر کردووە ولە تارانیش شوورای عالی وەزارەتی فەرهەنگ ئیجازە نامەی ئیفتا وتەدریسی بوّم دەرکردووە .

لەسالّی ۱۳۲۳ لەوەزارەتی فەرهەنگی ئەو روّژگارە و ئامووزیش وپەروەریشی ئێستا بووم بە ماموّستاو لە شارگەلی مەهاباد وسنە وخورەم ئاباد وتاران دەرسم داوە .لە سالّی ۱۳۴۱ لە دانشکەدەی ئیلاهی یات ومەعاریفی ئیسلامی دانشگای تاراندا دەورەی لیسانس ودوکتوّریم دوایی پێ داوە ولەدانشکەدەی ئەدەبیاتیش دا ماوەیەک خەریکی عولومی تەربیەتی و زمانەوانیش بووم لەو ماوەیەشدا لەدەبیرستانەکانی شاری تاران دەرسم داوە .

لەسالّی ۱۳۴۹ بووم بە ماموّستای زمان وئەدەبی کوردی دانشکەدەی ئەدەبیات وعولوومی ئینسانی دانشگای تاران،لەوماوەیەدا بێجگە لە دەرس دانی زمانی کوردی ئەدەبیاتی فارسی وعەرەبیشم تەدریس کردووە .

لەسالّی ۱۳۵۹ کە بە هوّی شوّڕشی فەرهەنگی یەوە ، زانستگای تاران داخرا ، بوّ من دەرفەتێک بوو تا لەمالّ دانیشم ونووسینی ئەورێزمانە کوردی یەم کەبە دەستەوە بوو تەواو بکەم .لەگەلّ ئەوەشدا خەریکی لەسەرنووسینی دیوانی مەولەوی (مەعدوومی) بووم وئێستاش هەر خەریکی ئەوکارەم .

"چوّن بوو خەریکی زمان و ئەدەبی کوردی بووم"

لەسەرەتای ئاوەزیانمەوە خەریک بوونی خوێندنەوەی هونراوەکانی مەولەوی،ولێ دوان لەماناکانیان لە لایەن ئەندامانی بنەمالّەکەمان ودوّستانەوە ،هانی دام کە پێوەندی یەکی بەتین لەگەلّ زمان وئەدەبی کوردی دا بهێنمە دەس .ئەم پێوەندی یە بووە هوّی ئەوە کەئەو ماوەیە کەلە کوردستانی عێراقدا ئەم خوێند ، زوّرتر خەریکی زمان وئەدەبی کوردی بم تالە سەرەتای دەست پێ کردنی شەڕی جیهانی دووهەمدا کە سیاسەتی فەرمانڕەوایی تورکیا گوّوارونامەنووسینی کوردەکانی ئەوێ بوّ ولاّتانی دەرەوە ،ئازاد کرا ، کاکم "محەممەدمیهری بەگ" کە پێش شەڕی جیهانی یەکەم شەهیدی نەمر ،شێخ عەبدوالقادری گەیلانی زادە لە شاری رەواندزەوە لەگەلّ خوّی بردبووی بوّشاری ئەستەمبوولّ (بەداخەوە من هەرچاوم پێ نەکەوت) ،بوّیەکەم جاربەکوردی نامەی بوّنووسیم ولەنامەکەیا زوّر هەلّی نابووم کە لە خزمەت کردن بەزمان وئەدەبی کوردی لەهەر هەل ومەرجێکدا کوّتایی نەکەم .ئەو هەلّنانی ئەوانە بوو بە هوّی ئەوە کە زوّرتر لەجاران خەریکی لێکوّلّینەوە لەزمان وئەدەبی کوردی بم .

لەسالّی ۱۳۳۸دا کە لە لایەن حوکوومەتەوە روّژنامەی کوردستان لە تاران دەرچوو پێشنیاری سەرنووسەری ئەو روّژنامەیەم قەبوولّ کرد

چونکە لە لایەکەوە بە هەڵێکی گەورەم زانی کە لەورێگایەوە بە پێی توانایی خۆم خزمەت بەزمان وئەدەب و مێژووی گەلە چەوساوەکەمان بکەم ولەلایەکی دیکەشەوە پێموابوو دەرچوونی ئەو رۆژنامەیە بەزمانی کوردی لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە باوەکوو مەبەستێکی تەبلیغاتیشی تێدا بووبێ ، بەڵام پێ هاتنێکی بەڵگەدار بوو سەبارەت بە هەبوون (مەوجوودی یەت)ی گەلی کورد زمان وئەدەب ونیشتمانی.

لەوساڵانەدا کەسەرنووسەری رۆژنامەی کوردستان بووم، گەلێ مەتالیبی ئەدەبی کوردیم نووسیوە و لەو رۆژنامەیەدا لە چاپدراوە هەندێ لەومەتڵەبانە ئەمانەی خوارەوەن :

١- کۆکردنەوەی نزیکەی ٢٥٠پارچە لە هۆنراوەکانی سەیید"عەبدورەحیمی مەولەوی" لەنێو بەیازە دەسنووسە کۆنەکان وراستکردنەوەیان وکورتە لێ دوانێ لە مانای هۆنراوەکان .

٢- کۆکردنەوە وراستکردنەوەی زۆربەی هۆنراوەکانی "وەلی دیوانە" .

٣- کورتە لێکولینەوەیەک لەدیوانی "مەلاپەریشان" ولە چاپدانی هەندێ لە هۆنراوەکانی .

٤- راستکردنەوەو لەسەر نووسینی دیوانی"سەیدسالحی کرماشانی" .

٥- راستکردنەوەی شیرین وفەرهادی دانراوی مەلا

"وەلەدخانی گۆران" .

٦- راستکردنەوەی هەندێ، لە هۆنراوەکانی"کەنیزەک و یازدەرەزم" کە بەشێکە لە شانامەی کوردی دانراوی "سەرهەنگ ئەلماس خانی کەنوولەیی" .

٧- زەنجیرە وتارێ لە بارەی رێزمانی کوردی یەوەلە ژێر سەردێری چۆن بنووسین و بخوێنینەوە" .

٨- زەنجیرەوتارێ لە بارەی ژیانی کۆمەڵەکەمان ورەخنەگرتن لە هەندێ بیرو باوەرورەسم ویاسای نالەباری کۆمەڵایەتی لەژێرسەردێری "لەکۆمەڵا چۆن بژین ؟" .

٩- کۆکردنەوە وراستکردنەوەی دیوانی مەلا "حامیدی ئالیجانی" لە ناوچەی ژاوەرۆ.

١٠- راستکردنەوەی شەرەفنامەی ئاسمان وزەوی ، هەڵبەستراوی "میرزاعەبدولقادری یاوەیی" .

١١- راستکردنەوەی جەنگەنامەی "کولەوعاینەمەل" هەڵبەستراوی "میرزاعەبدولقادری یاوەیی" .

١٢- کۆکردنەوەوراستکردنەوەی شوێنەواری شیعری گەلێ لە شاعیرەکانی کورد لە ژێرسەردێری:"لەهەرگوڵزارێ گوڵێ" .

١٣- چەندپارچەهۆنراوەیەکی نیشتمانی ونەتەوایەتی و عیشقی وچەند وردەچیرۆکی هۆنراوە بەشێوەی تەنز و توانجی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی وەک "چیرۆکی ملم

رێوی و پەپووسلێمانە و چرۆکی "فیل و بولبول".

١٤ـ زەنجیرە وتارێکی فەلسەفی سورشتی لەژێر سەردێری" رێگای خوداناسی".

١٥ـ مێژوولکەی حوکوومەتەکانی کورد.

١٦ـ راستکردنەوە ولەچاپدانی مناجاتی "خانای‌قوبادی" بەناوی " حەفت بەند".

ئەو مەتالیبە هەموویان لەژێر عونوانی"م.ص.م" کە کورتکراوەی محەمەدسدیق مفتی‌زادە"یە،لە ژمارەکانی رۆژنامەی کوردستان کە لە چواربەشدا بەرگ گیراون لە دەسدان.

رۆژنامەی کوردستان با وەکوو لەژێر چاوەدێری‌سەختی حوکوومەتدا دەرئەچوو، لەگەڵ ئەوەش لە راستەقینەدا خزمەتێکی گرینگی بە زمان و ئەدەب و مێژووی گەلی کورد ئەکرد.بەڵام پاش چوار ساڵ بۆ دەوڵەت دەرکەوت کە لەچاپ دانی ئەو روژنامەیە جگە لە زیان بۆ سیاسەتی دەوڵەت سوودێکی تێدا نیە،ئینجا لەبەر ئەوە لە سەرەتای بەهاری ١٣٤٢ دا رۆژنامەکە داخرا.

جگە لەو کارە ئەدەبی‌یانە کە لە رۆژنامەی کوردستان جێ بەجێم کردوون،لە ساڵی ١٣٣٨ وە تا پاییزی ساڵی ١٣٥٨ چەن زنجیرە وتاری ئەدەبیم لەبارەی ئەدەب و مێژووی کوردەوە نووسیوە و لە رادیۆی کوردی ئێران بڵاو بوونەتەوە و بەشێکی‌زۆری ئەو وتارانە لەدەست دایە.هەندێ لەو وتارانە لەژێر ئەم سەردێرانە بڵاو کراونەتەوە: لێک دانەوەی وێژەیی،بەسەرهاتی باو باپیرانمان،وێژە و وێژەوانان پەندی پێشینیان،راست کردنەوە و لەسەر نووسینی دیوانی نالی، شیعری شێوە گۆرانی کوردی مەستوورەی ئەردەڵان کەبۆ یەکەم جار لە نێو بەیازە کۆنەکان دا بە دەستم هێنابوو".

* * * *

. گرینگ ترین کاری مامۆستا دوکتور مفتی‌زادە شی‌کردنەوەی شیعرەکانی مەولەوی‌تاوەگۆزی یە. بۆخۆی لەپێش وتارێکدا کە لەسەر غەزەلەکانی مەولەوی نووسیویەتی دەڵێ:

" لە سەرەتای ئاوەزیانمەوە جاروبار گوێم لە هۆنراوەکانی مەولەوی ئەبوو کە خزمان و دۆستان لە کۆڕ و کۆمەڵی شەوانە و رۆژانەدا بە بۆنەیێکەوە دەیان خوێندەوە. جوانی وپاراوی ئەم هۆنراوانە کەم‌کەم سەرنجیان راکێشام و حەزم ئەکرد منیش وەکوو ئەوان ئەو هۆنراوانەم لەبەر بن و لە مانا و مەزموونی دڵرفێنیان تێبگەم.ئەم حەزە پاڵی پێوەنام کە رۆژ بۆ رۆژ زۆرتر لە هۆنراوەکانی مەولەوی بکۆڵمەوە، لە هەر جێگایەک دەسنووسێکی کۆن و تازەی شیعریم چاوپێ بکەوتبایێ،ئەگەڕام کە هۆنراوەکانی مەولەوی لەناو ئەو هۆنراوانەدا بدۆزمەوە و بە سەر و پێ شکاوی بیانخوێنمەوە".

بەداخەوە رەشەبای مردن مۆڵەتی نەدا بەروبوی باغی ئەم زانایەمان بەتەواوی دەس‌کەوێ و پێش تەواوبوونی ئەم کارە گرینگە دنیای بێ‌وەفای بەجی هێشت و شی کردنەوەی دیوانی مەولەوی بە ناتەواوی بەجێ ما.

مامۆستا محەمەد سەدیق مفتی زادە لە مانگی سەرماوەزی ١٣٦٣ لە شاری تاران وەفاتی کرد و لە گۆڕستانی وەیسولقەرەنی کرماشاندا بەخاک ئەسپێردرا هیواداریین بتوانین لە ژمارەکانی داهاتووی سروەدا هیندێک لە ئاسەواری ئەو زانا پایەبەرزە بڵاو بکەینەوە.

چون نووسەری ئەم وتارە ئەمری خودای کردووە، لەباری رێزمانەوە دەستمان لە نووسراوەکەی نەدا.

# کچە هەرمەنی

ق-بابامیری

مەڵبەندی موکریان شاهیدی لەمێژینی هەزاران کارەساتی گرینگی مێژوویی یەو سینگی دانیشتوانی پیری ناوچە مەکۆی گەلێک چیرۆک وئەفسانەی حەماسی ودڵداری یە. کەم وابووە ئازایەتی یەک لەم وڵاتە بووبێ وچەرخ وخولی زەمان توانیبێتی خۆڵی فەرامۆشی بەسەر داکا و لە پەردەی مێشکی خەڵکی ناوچە بیشواتەوە .

تە، کە چ شوێنێکی لە سەر بیروڕای دانیشتووان داناوە ومێشکی جەماوەر چۆنی وەرگرتووە ،دەبێ قارەمانی رووداوەکە چ کردەوەیەکی نواندبێ کە والە سینگی قایمی مێژوو رۆچووەوە و پاش ئەم هەموو سووڕوگەڕە پلەوپایەی بەرزی هەربەردەوام وبەهێز ماوەتەوە .

عەبدو لعەزیزی داسنی ، کاکەمەم ،شیخ فەرخ وخانی قارەمانی کارەسات ڕێبازی پەسندکراوی بۆهەڵکەوتووانی داهاتوو ،هەڵبژاردووە ، ئەوە راستی یەکی رووتە کە بە ئاشکرا لە هەموو قۆناغەکانی مێژووی گەلی کورددا ، وەبەر چاودێ و لەئاسمانی ئەدەبی فۆلکلۆر وەک ئەستێرەیەکی ورشەدار ، لە ترو سکانەوە وگرشەدایە .

ئەگەر چاوێکی ورد و بە سەرنجەوە بەسەر کتێبە مێژوویی یەکاندا بگێڕین لە لابەلای هەر دێڕەنووسراوەیەک تووشی کارەساتێکی حەماسی دێین ولە هەر قوژبنێک قارەمانێک سەر هەڵدەدا و زۆر زوو بەم راستی یە دەگەین کە مێژوو بەسەرهاتی ئەندامانی هەڵکەوتەی کۆمەڵە .

لە درێژایی مێژوو هەر چەشنە کارەساتێک کەقەوماوە وبنجی کۆمەڵایەتی بووە ، یا لە دێڕی نووسراوە و کتێبە مێژوویی یەکاندا جێی گرتووە ،یان ئەگەر ئەوەش ، نەگونجابێ ، لەسەر زاری بەیتبێژ وحەماسەسەرایان مەوزوون ورێک وپێک کراوە ولە قالبی فۆلکلۆردا وەک بەشێک لە فەرهەنگی رەسەن و خۆماڵی خەڵکی ناوچە لە مەترسی بەتاڵان ولەبیرچوونەوە پارێزراوە .

ئەوەی لەم وتارەدا شیاوی باس وسەرنجە ،نەفسی کارەسا-

لەپزێڕین لە کامە رەپێلگەوە بەرەوناخی مێژوو بەڕێ بوون کە ئێستاش ناوی بەرزیان لە سەر لێوی لەرزۆکی پیرەی بەیتبێژان هەربەتاوە وئاو دەزێنێتە چاو .

هەمیشە هەروا بووە ، کە شۆڕە سوارێک رکێفی لە ئەسپی ئازایەتی داوەو کەند ولەندی مەودای بەرەوئامانجی تروسکەداری نەتەوەی بڕیوە ، تەنانەت بەگلانیش هەرمان ونێودێری سوارچاک نەکەوتۆتە مەترسی لەبیر چوونەوە وکردەوەی بەرزی

گەلێک جاران باسی (کچە هەرمەنی)م لەزاری کۆنە پیاوەکانی وڵات بیستبوو ، بەڵام هەرتا ئەورادەیە کە فلان رووداو لە ساڵی کچە هەرمەنیدا ،قەوماوە یان فیسار کەسلەم ساڵەدا ،وای بەسەر هاتووە ،تا ئەوەی کە رۆژێک لە خزمەتی کاک عومەری عەلیاردا بووم و داوام لێکرد تائەگەردەتوانێ کورتەیەکم سەبارەت بە کچەهەرمەنی بۆ بگێڕێتەوە لە گەورەیی خۆیان رێنموونیان کردم وفەرموویان : تا ئەو جێگەیەی دەتوانی

پاڵ وەقسە ودەمگۆ مەدە و تێبکۆشە بۆ لێکۆڵینەوە و نووسین بەکتێب و نووسراوە مێژوویی یەکان پشت ئەستوور بی دەنا بێ شک بەهەڵەدە چی وسەرت لێ دەشێوێ.

پەندی کاک عومەرم لە گوێ گرت وئەمجار شوێنی کچە هەرمەنیم لە کتێب و نووسراوانەدا گێڕا. پاش هەڵگێڕوەرگێر کردنی چەند کتێب ،بەسەرهاتی کچەهەرمەنیم وەک لە خوارەوە دەیبینن نووسیوە وهیوادارم خوێنەرانی بەڕێز بەم کورتە مەقالەیە دانەکەون و بە یاری خودا ،لە ژمارەکانی دیکەی سروەدا ،چاومان بە توێژینەوەی پوخت وپڕنێوەرۆکتر روون بکەنەوە.

لەسەردەمی دەسەڵاتداری بنەماڵەی قاجار لەساڵەکانی دوایی چەرخی هەژدەدا ،بازرگانێکی ئینگلیسی بە ناوی (گرانفلید) بۆ تیجارەت دێتە وڵاتی کوردستان ،چەند ساڵێک خەریکی کەسب وکار دەبێ و ماڵ وسامانێکی زۆر وەسەریەک دەنێ ودەگیرسێتەوە لە ئەرمەنی یەکانی نیشتەجێی کوردستان ژن دەخوازێ و دەبێتە خاوەنی کچێک و ناوی دەنێ (کەتی). یازدە ساڵ پاش زەماوەند ،بازرگان دەمرێ وملک وماشێکی زۆری لەپاش بەجێ دەمێنێ ، کەتی لەژێر چاوەدێری دایکیدا گەورە وعازەب دەبێ ووەک هەموو کیژێک ئەویش بەحوکمی سروشتی ئینسانی دەردی ، ئەویندار ی سەری لێدەدا و عەزیزبەگ ناوێکی کورد دڵی لێ دەستێنێ.

ماوەیەک پێدەچێ و عەزیز رادەسپێرێتە دایکی کچە و خوازبێنی کیژەکەی لێدەکا ، بەڵام ژنی بازرگان جیاوازی ئایینی دەکاتە بیانووکچی ناداتێ کەتی داوا لە عەزیز دەکا هەڵیگرێ و رووبکەنە مەڵبەندێکی دوورەدەست. جووتەئەویندار دەستی یەک دەگرن وبەرەو وڵاتی عوسمانی دەکەونە رێ .کەتی دێتە سەر دینی ئیسلام وموسوڵمان دەبێ وبە ئەمری شەرع خۆی لە عەزیز مارەدەکا وناوی"فاتمە" بۆخۆی هەڵدەبژێرێ

ژنە ئەرمەنی شوێنیان دەگێڕێ وپاش ئەوەی جێگەیان دەبنە دەکا یارمەتی لە دەوڵەتی ئینگلیس دەوێ تا کیژەکەی لە عەزیزبەگ بستێنێتەوە لەلایەن سەفارەتی ئینگلیسەوە بە رەسمی داوا لە دەوڵەتی عوسمانی دەکرێ تا عەزیز بەردەست بکرێ و کیژی ژنە ئەرمەنی بدەنەوە دەست دایکی،بەڵام عوسمانی بۆ ئەوەی نەکەونە بەر تووک و گلەیی عولەمای ئیسلامی،هەل ومەرجێک پێک دێنن تا عەزیز دەستی ژنەکەی بگرێ وبگەڕێنەوە بۆساوجبڵاغی موکری (مهاباد ی ئەمڕۆ) ژن ومێرد دێنە سەر ئەو رایە کەخۆلەشابەندەرخانەی عوسمانی هاوێن وداوا لە تومای ئافەندی (شابەندەر) بکەن کە پەنایان بدا و لە بەرامبەر داوخوازی"ئینگلیس" دا لاگیرییان بکا ، هەواڵ بە سەفارەتی ئینگلیس دەگاتەوە وئەمجار لە سەر حکوومەتی ئێران دەکەن کە کیژی ژنە ئەرمەنی لە شابەندەرخانە وەدەرخەن وتەحویلی مەئموری ئینگلیسی بدەن ، تەلەگرام لە لایەن دەوڵەتی نێوەندی -یەوە بۆ حاکمی ساوجبڵاغ دەچێ وداوای لێ دەکەن کە بێ درەنگ عەزیز قۆڵ بەست و کچی بازرگان تەسلیمی سەفارەتی ئینگلیس بکەن کەچی بەرلەوەی حاکم،پیاوبنێرێتە سەر عەزیزبەگ، نێزیک بە سەد کەس لە خەڵکی ساوجبلاغ دەست دەدەنە چەک و بە هانایانەوە دەچن ولە دەوری شابەندەرخانە مەتەرێز دەگرن و تەنانەت وەک (ئیعتمادوسەڵتەنە) لە رۆژنامەکەیدا دەنووسێ،گۆیا چەند پیاوی حاکمیش هەر کە دەگەنە نزیک شابەندەرخانە بە دەستکوردە چەکدارەکان دەکوژرێن حاکمی ساوجبلاغ کە خۆڕاگری وبەرەنگاری توند و تیژ لە لایەنگرانی عەزیزبەگ دەبینێ ،وڵام لە دەوڵەتی نێوەندی دەنێرێ وداوا دەکا کە بە سولح وسەڵاحەت کێشەکە

ببڕێتەوە

سێ دەوڵەتی ئێران و ئینگلیس وعوسمانی بۆدیتنە ـ وەی ڕێگا چارەیەک،دەکەونە باس وراوێژ بەڵام پێداگرتنی شێلگیرانەی ئینگلیس بۆ ئەستاندنەوەی کچی بازرگان دەبێتە هۆی بێ ئاکام مانەوەی باسەکە ولە پاشان بڕیار دەدرێ لێژنەیەکی دیکە بگیرێ وروون بکرێتەوە کە کچە ئەرمەنی بەویستی خۆی موسو ـ ڵمان بووە یا عەزیز بەگ ، فریوی داوە و بە دەهۆ هێناویەتە سەردینی ئیسلام .

هەواڵ بۆ ئەمیرنیزام دەچێتە تەورێز ، ئەویش عەلینەقی خانی سەرتیپ لەگەڵ مستریترین (جێگری کونسوولی ئینگلیس) وبێهجەت ئەفەندی (ژێنراڵ کوونسولی عوسمانی) بۆ نێوبژی و نەسیحەتی سەربزێوان و ئەستاندنەوەی کچە ئینگلیسی وبەشداری لە کۆڕی لێکۆڵینە ـ وە دەنێرێتە ساوجبلاغ .

بێهجەت ئەفەندی وشابە ـ ندەر لەعەزیز وئاواڵەکانیان دەوێ کە لەوەپتر پێ نەچەقێنن وکچەکە بەدەستەوە بدەن دەنا بە هیلاک دەچن ، بەم قسانە لایەنگرانی عەزیز هێندەی دیکە بەڕقدا دەچن، بەتوندی هەڕەشە لە بێهجەت ئەفەندی دەکەن وبە تەما دەبن شابە ـ ندەر بکووژن کە بە هەزار کیشەکێش وپێ دزەڵە مەرگ ڕزگاریان دێ وبەرەنگ بزر ـ کاوی رادەکەنەوە ماڵی عەلینەقی خانی سەرتیپ

پاش پەیوەندی گرتن لەگەڵ سەفارەتی دەوڵەتی عوسمانی ودەوڵەتی ئێران و دوای چەند جار کۆبوونەوە لە لەندەن وئەستەمبووڵ ئەمیر نیزام ئیزن درا تابۆ سەر کوت کردنی چەکدارەکانی دەوری شابەندەرخانە لە تۆپ وباقی کەرەسەی شەڕ کەلک وەرگرێ .

قۆشەن دەڕازێنێتەوە وتۆپ وسواروسەربازێکی زۆر دەداتە دەست شازادە (نوسرەتوددەولە ) وبەرەو ساوجبلاغی موکری دەنێرێ.

لە رۆژی پازدەی زیحەجەی ساڵی ١٣٠٨ی کۆچیدا ،تۆپخانەی لەشکر عەزیز و چەکدارەکانی تۆپباران دەکا و شەڕێکی قورس دەستپێدەکا . پاش تەقە ولێکدانێکی زۆر فاتمە خانم رادەپەڕێننە ماڵی حاکمی شار ودەوری ماڵەکە گەمارۆ دەدەن ،تەقە دەوەستێ وحاکم دەستوور دەدا تا جێ بەجێ کۆڕێکی لێ پرسینەوە بە بەشداری جێگری سەفیرئینگلیس وئەمیرنیزام وچەند کەسێکیتر پێک بێ وروون بێتەوە کە کچی گرانفلیدی بازرگان چۆن موسوڵمان بووە ، فاتمە خانمیش حازر دەکرێ و لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا کە بەویستی دڵی خۆی موسوڵمان بووە یا بە زۆری عەزیزبەگ، دەڵێ :

ئەمن عەزیزم هاندا هەڵم بگرێ وبە رەزامەندی خۆم چوومە سەر دینی ئەوو زەماوەندم لەگەڵ کردووە و ئێستاش پەشیمان نیم وخۆم بە بەختەوەر دەزانم کە ژنی عەزیزبەگی کوردم پێدەڵێن .

دووجاری دیش ئەندامانی کۆڕ ئەم پرسیارەیان لە فاتمەخانم کردەوە بەڵام هەر ئەوەیان لێ بیست کە پێشتر گووتبووی .

لە کوتاییدا ،عەزیزدەستی خێزانی گرت ولە ماڵی حاکم دەرکەوتن وژیانی ئاساییان دەستپێ کردەوە .

وتوویژێك دەگەڵ: ع خزری

**پرسیاری ٤ـ ئایا باس کردن لە مەبەستی وەک ژن بە ژنە، رەدوو ، وەدواخستن وئەوباوە نالەبارانەی کە لە کۆنەوە ماون لە کاری لێ کۆڵینەوەی فۆلکلۆردا بە بڕوای تۆ شوێنێکی ناحەز و ناشیرینی نابێ ؟**

وەلام ـ ئەوباوە ناحەزانەی کە باستکرد و زۆر باو و رەسمی دزێوی دیشکاتێک ئێستاش هەن دەبێ دان بەوە دابنێین کە راستی یەکی تاڵ ونالەبارن ومادام کە هەن دەبێ باسی لێ بکرێ .

بەڵام ئایا لە کاری لێ کۆڵینەوەدا باس لێ کردنیان شوێنی خەراپی دەبێ یان نا ؟

بەڵێ ،ئەگەر نەزانین چۆنیان باس بکەین شوێنێکی خەراپی دەبێ . ئەگەر نەزانین چۆنیان باس بکەین کارمان وەک کاری ئەوکەسەی لێ دێ کە باسی زیانی سیغار کێشان لە لای سیغارکێشێک بکا .

ئەو سیغارکێشە ئەوەی تۆلێی دەترسێنی ئەو بە لەش وخوێن ودەمارو پێستەوە هەستی دەکا ولە تۆی باشتر دەناسێ .

واباشە بگەڕێیەوە سەر رەگ وریشە وهۆی ئەوباوودابە ناحەز و نالەبارە و لە بارێکی ترەوە بۆی بچێ وبەو زانستانەی کە دەیبینێ مەودایەکدا بنێی بۆبیرکردنەوە وئەوەی تۆ دەیزانی وئەوەی بڕوای وانە وئەوەی هەیە لە بەرانبەر یەکیان دابنێی ولق وپۆهەڵنەپەرتێوی وکارتبە رەگ وریشە بێ .

بۆوینە گۆرانی " لانک لانک لانکۆڵێ‌گۆرانی یەکی‌زۆر ناحەزە ومانا ونێوەرۆکی زۆر پر لە عەیبو ئیرادی هەیە ، "هەی رۆڵە سەردڵ خڕ بی باب مردووبی شەو درەنگە بۆ جێ ژوانێ" ،یانی دایکێک کە بەهەشتلە ژێر پێی دایە ، کە رۆڵەی ئازا و بە شەرەف پەروەردەکا ، کە بە نیشتمانی بزانین، کە لە داوێنیدا هەزاران قارەمان گەورە بن .وای بەسەربێ کەبەجێگەی ئەوەی منالێی بە شێوەیەکی پاک وسەربەرزانە دەخەو بکا ولایە لایەی وەک ، مامۆستا هەژار بۆ بلێ شەڕی دەگەل بکا کە زووتر بخەوێ هەتا رۆژ نەبۆتەوە و کەڵەشێری بەیانی لێی لە هەڵلا نەداوە و باوکی پێی نەزانیوە ،ئەو بچێتە لای زەلامێکی بێگانە ودلداری بکا ، خۆئێمە لەوەمان ناحەزتر نیە. یانی زۆرژن بە ژنە بوون کە جوان دەستی پێ کراوە وئێستاش بەباشی بەردەوامە .

بۆی هەیە زۆر رەدواکەوتن و زۆر رەدوخستنێک مەسەلەن هۆیەکی باشیان بووبێ و بۆ

وێنه هەڵگەڕانەوەیەکی بە
چێ بووبێ لە بەرانبەر زوڵم و
زۆرداریدا .

بەڵام خۆڵەوە ناحەزتر و
دزێوتر و ناڵەبارترمان نیە
دایکێکی کورد وا بە مناڵەکەی
بڵێ .

با هەر باس لەو مەبەستە
بکەین ،هیچ بیرت لەوە
کردۆتەوە لەوانەیە ئەو
دایکە لە سەر پشتی لانکێ
بە شوو درابێ ؟ هیچ
وێ ناچێ بە زۆر دابێتیان
بە پیاوێکی پیر؟ بۆ باس
لەوە ناکەی بەرخوێن بێ ؟
بۆ قسە لەوە ناکەی زاڵم
و زۆردارێک لە دیوی
زاوا و بووکایەتی رایکێشا-
بێتەدەر؟ بۆ بیر لەوە
ناکەیەوە ئێستاش لە ناو
کوردە کۆچەرەکاندا ئافرەت
دەفرۆشن وکاریان بەوە نیە
ئافرەتەکە رازی یە زاوا
پیرە، یان نا؟

لێرەدایە کارێکی پوخت و
جوانی فەرهەنگی و رووکردن
وهێنانەوە رووی هەموو داب
و باوێک تا چ رادەیەک پاک
وپیس لێک جیا دەکاتەوە و
دەتوانێ دەورێکی باشی
هەبێ .

ئەوە باری پیسی یەکەی بوو
دەشتوانین باس لە گەورەی
بکەین ،ئەوشێرەژنە قارەما-
نەی ناوچەی موکریان کە
مناڵی دووساڵەی ، کۆرپەی
خۆشەویستی لە بەر چاوی بە
زیندوویی لەت وکوت کرا .
بەڵام ناموس و شەرەفی خۆی
نەفرۆشت وڕووداوی دڵتەزێن
و پڕلەشەرەف و ئازایەتی
"ئەشکەوتی گەوەر"ی بۆ
هەمیشە لە نێودڵاندا جێ
کردەوە .

ئەوانەن ئەو بارە جوان و
ناحەز و ناڵەبارانەی کە
دەکرێ شان بە شانی یەک
باسیان لێ بکرێ و شی
بکرێنەوە .

بەر لەوەی کە بڵێی ژن
بەژنە ،رەدواخستن ،رەدووکە
وتن،بەرخوێن ، چوونە حاشایە
خراپە ، دەبێ هەوڵ بدەی
لە رێیەکی راست ودروست
و زۆر نیزیکەوە رادەی تێ
گەیشتنی خەڵک بەریە سەر ،
زۆر باری تر بگۆڕی هەتا
مەودایەک بۆ خۆنواندنی
ئەو بارە ناحەزانە نەمێنێ
ئەوکات کۆمەڵ دەزانێ نابێ
مناڵ لە سەر پشتی لانکێ بە
شوو بدەی ،نابێ بەرخوێن
بمێنێ ،نابێ ژن بە ژنە
بکرێ ،نابێ کچ بۆ بابیان
بە مێرد بچن ،و ئافرەتیش
وەک هەموو ئادەمیزادێک
دەبێ مافی ژیانی هەبێ و
لانی کەم تەرخان بکرێ لە
شەریکی ژیان هەڵبژاردندا
کە کۆمەڵ تووشی فەسادنەبێ
کە هەزاران رووداوی دڵتەز-
ێن روو نەدەن .

بەڵێ دەبێ باس لە
مارەیی زۆر وشیربایی وخاوەن
کیژی سامان دار و لاوچاکی
بێ دەسەڵاتی هەژاریش بکرێ .

ژن بەژنە ، رەدواکەوتن
رەدووخستن ،بەرخوێن ،شیر
بایی چوونە حاشاو.........
هەزاران رووداوی دڵتەزێن
وخەمهێنەر یان دەگەڵە کە
لەبەر چاوان نین .

کاتێک پیاوێکی هەژار
خێزانی دەمرێ و بە هۆی

هەژاری ونەداری ناچارە منداڵەکەی لە سەر پشتی لانکێ بەشوو بدا وخۆی بۆ سەرپەرستی کوڕی ساوای ژن بخوازێ،کاتێک کیژی حەوت هەشت ساڵە لە کوورەخانان قالبی بیست کیلۆیی هەڵدە – گرێ و زۆر جار ئەوانەی لە کوورەخانان کچ بنە شوو نادەن ئەوەیان لەبەر چاوە کە دەستێکی کاری لە کار دەکەوێ ،کاتێک باوکی کیژ پێی سەرشۆڕی بە کچ بدا بە لاوێکی کە کرێکارە و مەسەلەن خاوەن ماڵ وسامان نیە وهاوشان نیە ، چۆن دەتوانێ باری ئابووری لە بەرچاو نەگرێ و بۆ دەبێ بە سەروسەکوتی هیندێک بێ دەرەتانی بەستەزمان دا بدەی .

هەڵبەت کاتێک هەوڵ درا بۆ بردنەسەری زانایی خەڵک وبردنە سەری تێ گەیشتوویی خەڵک هیچ کام لەو بەڵگە و دەلیلانە بۆ پاکانە نابن

**دەبێ کۆمەڵ خۆی بناسێ باب وباپیری خۆی بناسێ رابردووانی بناسێ ، پلەی بەرزی ئینسانی خۆی بناسێ و ئەوەش کارێکە بە نووسەر و شاعیر وزانایانی ئەو گەل و نەتەوەیە دەکرێ کە لە هەرەوەرزێکی هەموو لایەنەدا بە پێی بەرنامەیەکی دیاری کراو و ورد و جوان ولەبار هەوڵی بۆ بدەن و لە لێ کۆڵینەوەیەکی فۆلکلۆریدا دەبێ باس لە تەواوی ئەو مەبەستانە بکرێ چ جوان چ نالەبار وناحەز کە کۆمەڵ بە پێی زانستی خۆی لەو بازاڕەدا کە هەموو جۆرە**

**کالایەکی تێدایە پاک وپیس لێک جیا بکاتەوە. ئاشکرایە لە ئاکامدا ئەوەی باش و بەکەڵکە هەڵی بژێرێ ومالی قەلب سەر وەساحەبی .**

**پرسیاری ٥- هیندێک لەسەر ئەو بڕوایەن کە خستنە رووی هەموو بارێکی رووحی وئەخلاقی نەتەوەیەک بە شێوەی لێ کۆڵینەوەیەکی کەلەپووری وفۆلکلۆری نە تەنیا سوودی نیە بەڵکە زۆریش خراپە وبە زیانی ئەو گەل ونەتەوەیە تەواو دەبێ .**

وەڵام- بەڵێ، دەڵێن :

دوژمنانی کورد، بەو ناوو بەو بەرگەوە دێنە نێومان یان کاری خۆمان لەو بارەوە کاریان ئاسان تریش دەکا کە باشترمان بناسن وبە پێی باری رووحی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی مان بەرنامەمان بۆدا ڕێژن .

بە بڕوای من بەپێچەوانە خۆمان دەبێ لەوە بترسێنین کە خۆمان نەناسین ونەزانین دوژمن بە کام ڕێگەوە و لە کام لاوە بە سەرمان دادەدا .

ئایا ئەو بەڕێزانە لە "**نقطەضعف**"**ەکان** دەترسێن یان لە بارە جوان وبەرزەکان و بۆ بڕوایان وایە خۆمان شارەزاییمان نەبێ بە سەر ئەو"نقطەضعف"انەدا کە چارەسەریان بکەین ؟

راستی ئەوەیە ئەگەر هەموو بارەناحەزوجوانەکانی رووحی وئەخلاقی وکۆمەڵایە –

تیمان بناسین هەر بێ هیچ هەولٚ وزەحمەتێک باری ناحەز دەشۆرێتەوە وباری جوان پەرە دەستێنێ وئەوەی باش و لەبار وقەلەو و پەسندەی خۆمانە و ئەوەی کوێر و کوێزرە لە بەین دەچێ دەزانین هەویرەکەمان چەندە ئاو دەبا ،دەزانین بۆی هەیە دوژمن لەکام دەرکێکێ شک بۆنەچۆوە دێتە ژوور و هەر کەس‌هات‌گوتی :" شیرم دەگوانان دایە وگیام دەبنی ددانان دایە" دایکمان نیە وخۆی هەر جۆر رەنگ‌کرد هەر گورگە .

ئاخۆ وەک "تیتل و بیبلیشمان" پێ نەکرێ ؟!

**جابا زۆرداریش بە سەرمانداbدا .... لاپەرەی بەیتی بۆدەکەینەوە و لێی دەبینە "ناسرومالٚ مالٚ" و "برایم ومەحمەلی دەشتیان و" عەرفۆوچەکۆ" و .........**

**لە بەرانبەریدا رادەوەستین و وەک "برایمی میرە دیزکەرێ" راستەوخۆ دوژمن دەگرین ونابینە "دۆن کیشۆتی خەولێ زڕاو ،هەربەدەپازدە کەسان وابەسەر"دەهەزار یۆنانی دادەدەین کەگزنفۆنی رۆمیش پێمان هەلٚبلێ لە بەرانبەر ئازایەتی و پیاوەتیمان سەری کرنۆش دانەوێنێ .**

ئەو کەسانەی کە **وابیردەکەنەوە زۆر رەوشەن بیرانە دەبنە دۆن کیشۆت !**

**هەر لە لای پانایی ڕا دەڕواننە ئەو مەبەستە سەرنج نادەنە درێژایی کارەسات .**

**کاکە رێو وراست بەئێمە دەلێن "ئەولادی نۆکەری لاسارى سولەیمان " منالی دێو و جندۆکە و ئالٚ وشەوە" لە قسان پێغەمبەر (د.خ) تووک و دوعای لێ کردووین ، بە وەحشی وسەربڕ ودرۆزن و بێ ئیمان وخوانەناسمان دەزانن با لانی کەم دوژمن باشمان بناسێ و بزانێ وانین با لانی کەم بێ دەنگ نەبین و خۆمان بناسێنین وپێمان نەلێن وایە بۆیەبێ دەنگن .**

کاتێک بۆ وێنە یەکێک بیهەوێ لە بەیتی دمدم بکۆلێتەوەولێ کۆلینەوەیەکی بەربلاو بکا ناچارە باری مێژوویی ئەو رووداوە بێنێتە بەرچاو، بێ گومان پێویستی بە کتێبی "تاریخی عالەم ئارای عەبباسی"دەبێ کەوابێ هەتا ئێرە ئەوە خەریکی کارێکی لێ کۆلینەوەی ، فۆلکلۆر و کولتووری نەتەوایەتین با بزانین نووسەری "تاریخی عالەم‌ئارای عەبباسی ئێمەی چۆن ناسیوە و خۆی چۆنە وئێمە چۆن بووین .

**ئەسکەندەربەیگی تورکمان مونشی وکاتیبی تایبەتی شاعەبباس‌کە شاعەبباس بە نووری خودا ودادگەروخێر خواز وبەرەحم وبەدین دەزانێ ئاشکرایە جێی خۆیەتی بڕوای وابێ ....... کورد دین وئیمانی نیە ، پیاوەتی نیە ، ئەو کاتەی بە قورعان سوێندت بۆ دەخوا هەر پشتت‌تێ کرد لەپشتەوەڕا بە خەنجەر لێت‌دەدا . کورد نازانێ نامووس و پیاوەتی و ویژدان چیە و... کورد....." .**

بەلاّم راستی ئاوا شەق لە درۆ هەلدەدا وئەوبێ ئیمانە وئەو خۆفرۆشە زۆر زوو روورەشی خۆی دەبینێ کاتێک ئاوا ناجوامێرانە باسی کورد دەکا وهەرچی شیاوی خۆی و ئەربابەکەیەتی بە کوردی دەلێ هەر دوولاپەرە پاشی دەنووسی :

**"کوردەکان دوو تفەنگ**

چی‌یان‌که یەکیان ئیسفەهانی بوو ،وئەوی تریشیان پازۆکی بە بریندا ری بە دیل گیرت و بردیانە نێو قەلاوپاش ئەوەی کە تیماریان کردن وچاک بوونەوە ئازادیان کردن و ئەوەیە وەلامی ئەوپیاوەتی‌یەی شاعەبباسی کە هەر ئەسکەندەر بەگی مونشی بە شانازی یەوە باسی لێ دەکا "....شای ئیسلام پەنای بە رەحم ونووری خودا بەرووداوی ئەو کوردە ناموسولمانە وەها توورە بوو کە مەگەر خوێنێکی زۆری رشتبا ئەگینا ئاگری رق وتوورەیی دانەدەمرکا بەو بۆنەوە، بەرەو قەلای کاودۆن وەرێ کەوت وئەو چەند رۆژەی پۆل پۆل ودەستە بە دەستە خەلکیان دەهێنا " و معروض تیغ سیاست کشته بهرام خون آشام لحظه‌ای از تیغ زدن و خون ریختن نمی‌آسود و مجملا" دود از دودمان طایفه مکری برآمده ومردان طعمه شمشیر آبدار و نساء وصبیان بذل اسرورقیت گرفتار آمده مکافات عمل یافتند بعد از چند روز که صورت غضب پادشاهی فی الجمله تسکین یافت...." ئەوەیە مانای ناپیاوی و ناموسولمانی و....کورد وئەوەیە مانای عەدالەت وپیلوەتی شاعەبباس بەلێ دوژمن ئەگەریش ئاوامان بناسێنێ خۆشی دەناسێنێ ولانی کەم ئەگەر خۆمان بناسین بڕوامان وانابێ ئەسکەندەر بەگی تورکمان پیاوێکی باش بووەو خۆشمان هەر لە نووکەوە بەدفەڕ و نەسرەو بووین

چ ئیرادێک لەوەدا دەبینن دوژمن بزانێ و خۆشمان بزانین .

"هەوریک ناوی پیرێژنێکی بێوەژنی هەژار و نەدار بوو لە هۆزی حەسەسووری جەلای کە لە زستانی سالی ١٩٢٩ لە شەڕەکەی ناوچەی"ئۆرتۆلۆ"ی تورکیە هێزی دەولەتی تێ شکان وسەربازێکی زۆری ، تورک بەدیل گیران دیتی گۆرەوی یەکێک لەئەسیرەکان دڕاوە لەو بەفرو سەرما و بەستەلەکەدا گۆرەوی خۆی دانا و دای بەو سەربازە کە لاقی سەرمای نەبێ .

بەلێ ،دەبێ خۆ بناسین ودوژمنیش بمان ناسێ .

ئاندرەئامێدو ژنەکەی کە تەنانەت کوردەکانیش لە کوردیان ترساندبوون لە بیرەوەری یەکانی خۆیاندا دەلێن :

"رۆژێک دەگەل خیزانی لە ئاوایی یەک لادەدەنە مالێک دەبینن ژنێکی هەژار وبێ کەس ودوومنالی پاپەتی نانێکی رەق و کاسەیەکی چکۆلەیان ماست لەبەردەمیان داناوە و خەریکی خواردنن هەر کە ئەو دوانەیان لێ وەژوور دەکەون منالەکان دەکشێنەوە ،ژنەش کاسە ماست ونانەڕەقەکە دێنێتە بەر دەستی ئەو ژن وپیاوەپاش ئەوەی کە ئەوان نان و ماستەکە دەخۆن لە دایکی منالەکان دەپرسن بۆچ نان و ماست نادەی بە منالەکانت ژنە دەلێ : هەر ئەو پیالە ماستە وهەر ئەو نانەڕەقەمان بوو .بەلام فێرکراوین خۆشمان ومنالیشمان کە میوان هات میواندا ری لێ بکەین .

کاری لێ کۆلینەوەی فۆلکلۆری و کەلەپووری نەتەوایەتی بەو مەرجەی بە شێوەیەکی لەبار بکرێ و سەرنج بداتە هەر سەرهەوداـ یەک ناچارە ئەوراستەقینانە بهێنێتە روو و روون‌بوونەوە ودەرکەوتنی ئەو مەبەستانە شوێنی دەبێ .لە چوونە سەری زانیاری خەلک لە رێبازی خۆناسیدا وئەو خۆناسینەش تەنیا شتێکە کە دوژمن لێی دەترسێ ورێگەی فریودان و هەر رۆژە بە بەرگێک هاتنە کایەوەی لێ دەگیرێ .

# ئەدەب

بێ زەوق و مەحەببەت مەی و مەیخانە دەڵێ چی ؟
بێ نەشئەیی زاتی بەت و پەیمانە دەڵێ چی ؟

هەر سیدقە دەبا مەردی خودا ڕێگە بە مەقسوود
شیخ و شیحەن و کەعبە و بوتخانە دەڵێ چی ؟

عاقڵ ئەوەیە قەیدی عیلاقەی نیە وەک شێت
فەزل و هونەری عارف و فەرزانە دەڵێ چی ؟

زادی ڕەهی هاموونی تەریقەت مەبە زاهید
ویردی سەحەر و سوبحەیی سەددانە دەڵێ چی؟

تۆ ناو و سەری شەمع مەبینە کە دەسووتێ
پڕوانە لە سۆزی دڵی پەروانە دەڵێ چی ؟

باتین ئەوەیە مەخزەنی ئەسرارە سەراسەر
بێگەنجی حەقیقەت دڵی وێرانە دەڵێ چی ؟

میسباح ئەوە سائیرە نووری لە هەموو جێ
قەندیلی زەڕ و زیوەری کاشانە دەڵێ چی ؟

واعیز وەرە یەک هەفتە (ئەدەب) فێربە لەلای من
پەندی بە ریا و لۆمە و ئەفسانە دەڵێ چی ؟

# « راوچی یان »

راوچیان راوه چ راوه
راو لە بنی بەردی گوێزێ
ئەسپان زین کەن، لغاوه
تاجیان بەرنە دەرێزێ
چاوی سەرم بن راوچی
لێی بستێنن پەرێزێ

* * *

راوچیان راوه ، چ راوه
راو لەدەشتی لاجانێ
ئەسپان زین کەن لغاوه
تاجیان بەرنە سەر لانێ
سەفی سواران چەند جوانن
لەبەر مالی ماشکانێ

* * *

راوچیان راوه،چ راوه
نۆرە راوی دەشتێیە
سەرێ زۆر چاک بڕوانە
ئەوە لانی شەوێ یە
سەری ئەسپت لەپێش بێ
پاشبار نەکا لەو جێیە

راوچیان راوه چ راوه
راو لە دەشتی بێتوێنێ
ئەسپان زین کەن لغاوه
تاجیان بەرنە سەرشوێنێ
بۆم بانگ کەنە بەرراوی
لە لانێی هەڵ بستێنێ

* * *

راوچیان راوه چ راوه
راو گەیشتە بەر زینێ
ئەسپان زین کەن لغاوه
خۆ باوێنە سەر زینێ
وەرن سەیری تاجیان کەن
لەگەڵ کەروێشکە شینێ

* * *

شینکێ دەلانێ دایە
کەوتووە بە بێدەنگی
بڕۆ و هەڵی بستێنە
بە شەقەی دە ئاوزەنگی
جا با راومان بەتاڵ کەین
رۆژمان کەوتە درەنگی

* * *

## «نوێ جێژنە»

شەریف

نەماون بێکەس و گۆران عەزیزان
کە شیعری شینی هێمن دابڕێژن

گوڵی فرمێسک و عەتری شیعری تازە
بەسەر خاکی مەزاریدا بڕێژن

موریدانی پەرۆشی پیری گەورە
شیاوی ناوی بەرزی وی چ بێژن؟

ئەوانەی چاوەڕێی گوڵ بوون لە ڕێگای
دەبێ دەردی دڕووی دووری بچێژن

بەراستی تاڵ و ناخۆشە کە یاران
بە دەستی خۆ عەزیزی وا بنێژن

دەڵێن نوێ جێژنە مانگیش نادیارە
ئەتۆ مانگ بووی کەچووی، چۆن بوو بە جێژن؟

چ جێژنێ لاوەکان فرمێسکی دووریت
بە بێژنگی مژۆڵان دادەبێژن

نەبوو نووسراوەیێ تەسکینی دڵ بێ
قەڵەم ئەمڕۆ هەموویان کاس و گێژن

بە شوێن تۆدا گەلێکی دڵ بریندار
لە لای کێ داخی دڵیان هەڵبڕێژن ؟

لەبیرم ناچێ ئەو پەندەی کە فەرمووتە
گەلێ لێکدانەوەی دوور و درێژن :

دەبێ ئاڵای شیعر بڕوا بەرەو پێش
ئەگەرچی ڕێگە زۆر هەوراز و لێژن

* * * *

نەماون بێکەس و گۆران عەزیزان
کە شیعری شینی هێمن دابڕێژن

سەد مخابن ناڤ مەدا بوو شاعرێ ڕۆشن ڕەوان
ئەڤرۆ چاوا ژمە جودا بوو "هێمنێ"شیرین زمان

بلبلێ باغێ ولاتێ، شاعرێ کورد و جڤاتێ
شێعرونووسین هندە ڕێک و هەروەکی ئاڤێ ڕەوان

ناڤ وبانگێ شێعرێ"خانی" ئەووەلە"هێمن" ژی سانی
لێ...وی ئازار زێدەتر دی، پێشەوای هوزانەڤان

باس نەکە ، نەرمی و ئەڤینی،علمودین و کورد حەبینی
دل نەترس و مەردەمێر وعەقل وهوش دەریایی پان

ئارەزوو بووم بۆ دیداری، شێعرێ پرتام و وتاری
شێنی یا دلکێ( مشەختی) ،هەم پەسەندێ شاعران

سەد درووودم سەر حەیاتی، داخدارم بو وەفاتی
حەق نەبوو زوو مە بهێلیت بۆ خەموکۆڤان و ژان

سروەی ئازیزی عەنبەر بێزەکەم
ڕووناکی دیدەم هیوا و هێزەکەم
بەرامە وبۆنت دای لە دەماخم
کردی پەرداخی رووحی ناساخم
فێنکاییت منی هاوردۆتە حاڵ
خەریکم ئەفڕم بە باڵی خەیاڵ
بەرەو ئەو ئاسۆ تۆ بۆی، ئەڕوانی
سروە جوانەکەی بەری بەیانی
هیوایە هیوا بۆمان بمێنی
تینوویی و تاسەی دڵمان بشکێنی

تاران-ف موحەمەدی

هێندێک قسە دەگەڵ خوێنەران بە تایبەتی دایک وباوکان :

ڕەنگە ئەمڕۆ فێرکردن و عاملاندنی منداڵ یەکێک لە گرینگترین ئەرکەکانی ئێمە بێ . منداڵی ئێمە هەوێنی مێژووی پاشەڕۆژ و پێشڕەوی چەرخی نوێن .منداڵی ئێمە یانی پاشەڕۆژی ئێمە ،تەربیەتی چاک ،پاشەڕۆژی بەختەوەرانەی ئێمەیە وتەربیەتی خراپ دوارۆژی ناخۆشی ئێمەیە و ڕووداوی تاڵی بەدواوەیە .

منداڵ دەبێ چاک تەربیەت بکرێ. ئەمڕۆ ئیتر کەم کەس هەیە نەزانێ ئەمە ئەرکێکی گرینگەو زۆر لازمە .چاک تەربیەتکردن، ڕێگای خۆی هەیە ،دۆزینەوەی ئەو ڕێگایەش زانستی تەربیەتی پێدەوێ .

زانستێکی باسی فێرکردن و عاملاندن دەکا "پیداگووژی" یا زانستی تەربیەتکردنی پێدەڵێن .

نووسین لەبارەی پیداگوو ـ ژیدا ئەگەر کەمیش بێ ،کارێکی گەلێک دژوارە وبەرلە هەموو شتێک ئەزموونێکی زۆری گەرەکە لەمەش بترازێ ،پیداگووژی لەچاو زانستیتر تازەیە و تا ئێستا لە ئێران نەبۆتە باو ،ئەویش لە ئێرانێکی کە تەربیەتکردنی منداڵ هێشتا حاڵەتێکی سوننەتی هەیە ئەمەش خۆی ئەزموون و تەجرەبەی ئێمەی خستۆتە مەنگەنەوە .بۆوێنە "لێدان" هێشتا ڕێگەی هەرەبەرچاوی عاملاندنە وهێندێک دایک و باوک پێیان وایە ،لێدان لازمە وزۆریش قازانجە و دایک و باوک دەبێ لە منداڵ بدەن .

باب وباپیران لە خۆڕا نەیانگوتووە :کوتەک دەزانێ قۆناغ لە کوێ یە .بەعزێک دەڵێن :"منداڵ تا منداڵە دەبێ لێی بدەی دەنا کە گەورە بوو لێدان تەئسیری مەنفی (سەلبی) لە رووح و ئەخلاقی دەکا .

گرۆیەکیش دەڵێن : نابێ هەمیشە لە منداڵ بدەی بەڵام جاروبار بۆئەوەی کاری چاک بکا ،لێدان پێویستە ". ئەو دایک وباوکانەی "لێدان"یان پێ ڕەوایە لە نێو موعەللیماندا هێندێک لایە ـ نگریان هەن. ئەمانەش لە مەدرەسە ،بەکردەوە دیفاع لە "لێدان" دەکەن .

هەر چۆنێک بێ تەمێ کردن (لە لێدان بەدەر )ڕێگایەکی تەربیەتکردنە ،چاک تەربیەت کردنیش هەم تەمێ کردنی پێدەوێ هەم تەشویق کردن. ئەڵبەتە چونکە تەمێ کردن و زۆری ڕێگایەکی فرەگرینگ و دژواری تەربیەتکردنە وباسی ئەمەش جارێ لەئەستۆی ئەم وتارە نیە ،ئێمە هەوڵ دەدەین باسی زەرەر وزیانی لێدان بکەین کە بەهەڵە بۆتە ڕێگەی عاملاندن و ئێشێکی گەلێک

دزێوه .  ئەوکارەی دایک وباوک و لە ئەغلەب خۆی لێ دەبوێرێ و

# .... ئیترلێدان بۆهەمیشە قەدەغەیە .....

لە پێشدا ئەوەندەش بڵێین با خوێنەری بەرێز پێی وانەبێ ئێمە نوسخەی حازروبزرمان بەدەستەوەیە وبۆهەموومەنزوور- ێکی تەربیەتی بۆی دەپێچینەوە ونیازی پێک دێنین ! چونکە زانستی تەربیەت کردن کۆمەڵێک ئەسڵی کوللی وقانوونی نووسراوە ،کەلە سەربنچینەیەکی پتەو دامەرزاوە .ئەم بنچینە پتەوەش بەرهەمی ئەزموونی موعەللیم وموڕەببی وپسپۆڕی سەرانسەری دنیایە کەلەکۆنەوە تا ئەمرۆ پێوەی خەریک بوون . لە پێشان بە گشتی و کورتی باسێکی ئەوان شتانە دەکەین کە منداڵان دەخەنە بەر حوکمی لێدان.ئەوشتانە هەر چەندە بە رواڵەت جوورا وجوورو لەیەک دوورن بەڵام ئەگەر هێندێکیان لێ ڕابمێنین نێوەرۆکیان لەم رەنگەیە :

زۆری کردن لە منداڵان تاکوو بەقسەی کەس وکاری لەخۆ گەورەتریان بکەن.پێش گرتن لە هێندێک عەیبی وەک بەجێ نە- هێنانی تەکلیفی مەدرەسە. درۆ کردن ،شپرێوی ،دزی ،بێ شەرمی لاساری ،..... هەروەها پێک نەهێنانی ئەرکی خۆ یا خۆگەورەتر بە منداڵی دەسپێرن بۆ کاری وا دایک وباوک رەنگە بەلێدان سەرکەوون ! ئەویش تەنێ تا رادەیەک ، بەڵام سەرکەوتنی وەها ،رواڵەتی وکەم دەوامە وئاقیبەتی بەزین وشکانە . زۆروا هەیە دایکێک پاش ئەوەی لە منداڵە- کەی داوە ،دانیشتووە و تێر گریاوە .واگریمان موڕەببی یەک دەخوازێ منداڵێک والێ بکا وەکوو کۆیلە دەستەونەزەر وبە گوێ بێ ،بۆپێک هێنانی ئەم نیازەش لە منداڵەکە بدا ،ئاخۆ چی روو دەدا ؟ پێش هەموو شت منداڵەکە وادەزانێ : "حەق هەمیشە ئی زۆردارە پیاو ناچارە حوکمی لەخۆ بەهێزتران راست یاچەوت بەجێ بێنێ " . وا گریمان موڕەببی حەقی بەدەستە وئەگەر منداڵەکەی مەجبوور کردووە بەقسەی بکا بۆ کاری چاک بووە ، بەڵام ئاخۆ چی ئەو نیازەی لێگرتووە ،وادەردەچێ؟ ئەمجار رەنگە منداڵەکە خراپتری لێ حاڵی بێ و کاری چاکیش هەر بە کوتەک کاری و لێدان راپەڕێنی .

ئەوی راستە ئەگەر منداڵ ، لەسەر کارێک وێی کەوتبێ

ئەمەش نیشانەی تەئسیری نالە- باری ئیسلاح کردنی منداڵە .

لە خێزانێکدا منداڵێک کمۆدی دایکی دەکاتەوە و هێندێک پارە هەڵدەگرێ،پاشان دایکی پێدەزانی،لێی دەغەزەب ڕادەچێ وداركاری دەكا .باشە ، ئیتر منداڵەکە بەرواڵەت کاری وا (دزی ) ناکا .

بەڵام زۆر پێ ناچێ دایکەکە تەماشا دەکا لەو دراوەی بۆ شت کڕینی نێوبازاڕ دەیدا بە منداڵەکەی خۆی بڕێکی لێ هەڵگیراوە ،لەپاشان بۆی دەردەکەوێ ئەمکارەی لەگەڵ ئاواڵەکانی کردووە . دەجا بۆمان ئاشکرابوو لێدان تەنێ

عەیبەکەی شاردۆتەوە ونەیتوانیوە بنەبڕی بکا .ئەمجارەش لێدان کەلکی نەگرت ،تەنانەت زەرەریشی دا :"عەیبی منداڵی شاردەوە .لەمەش خراپتر شاردنەوەی ئەم عەیبە خوویەکی زۆر خراپی دیکەی لە منداڵەکە زێدەکرد ئەویش درۆزنی و ریایی یە .با مەسەلەکە لە روانگەیەکی ترەوە تەماشا بکەین .گریمان هەرکە منداڵەکە لێی دزا ئیتر دەستی لەکاری دزێوی دزی هەڵگرت ،بەڵام ئاخۆ بە لێدان چاکتر بووە؟ نا ، لێدان ژان وئێشی پێگەیاندووە شکاندوویەتەوە ،ترسی وەبەر ناوە .ئەگەر منداڵەکە وازی لەم کارەناڵەبارە هێناوە لە ترسی دەردوئازار بووە کەبەسەر ئاوات وتاسەیدا زاڵ بووە رەنگە دایک وباوک مەتڵەبیان وەدی هاتبێ بەڵام ئەم وەدی هاتنە زۆری تێ چووە یانی ئەوان بە"پەرەسەندنی سفەتی وەک ترسەنۆکی "بەمرادی خۆیان گەیشتوون .نابێ لەبیریشمان بچێ ئەم"لێدان"ە رەنگە زیانی لە"سلسلەی ئەعساب"ی منداڵەکە دابێ چونکە لێدان گەلێک جاران دەبێتە هۆی نەخۆشی یەکی بەهێزی عەسەبی . دەجا سەرکەوتنێکی کەم دەوام چلۆن دەتوانێ پاکانەی زیانێکی ئاوا زۆربکا؟ کەوابوو لێدان دەتوانێ مل بە منداڵ بدا بەڵام خوێڕی و ترسەنۆکی دەکا . جا ئەگەر مەودابدەین تا هەموولایەنێکی منداڵەکە بەهێزتربێ رەنگە دڵڕەقوبێ عار دەربێ.

هەر چۆنێک بێ "لێدان " هێندێک سفەت وخووی نامەقبوولی وەک تووڕەیی ،تێک چوونی ئەعساب ،گزیکاری ، ریایی ، درۆزنی و ... تووشی منداڵ دەکا . ئەگەر ئێمە چاو لە هەموو زیان وزەرێکی"لێدان"یش بپۆشین هێشتا دایک وباوکی ئیستیعدادی گەشە بکا و وزە و ورەی پتەوبێ .

تەنانەت ئەگەر لە مەدرەسەش منداڵێک یا تازەلاوێک کارێکی دزێو بکا ،پیداگووژی دەڵێ : نابێ ئیرادە وشەخسیەتی ئەویش بەلێدان ـ سەرکوت بکرێ .پیداگووژی هەوڵ دەدا ، رێگەی راستی دەسەلات بۆفیر کردن بدۆزێتەوە .

بەرێز ناتوانن ببن بە قازی یەکی لێزان وپاکانە بۆ ئەم کارە بکەن کەدژی ئینسانەتی یە ورێگای عاملاندنیش نیە .چونکە "لێدان"ئەگەر بە رێگایەکی تەربیەت کردنیش دابندرێ-کە دیارە ئەمەش هەڵەیە ـ رێگای تری تەربیەت کردنی منداڵ لە دایک وباوک ، دەگرێ .

دایک وباوکی ئازیز!دۆستی بەرێز وخۆشەویست! پیداگووژی باسی ئەوە دەکا کەنابێ زۆری لە منداڵ بکەین ، دەبێ ئێمەش ئەگەردەمانەوێ مرۆی ئازاو بەکار وشێلگیرو"خاوەن فکروئاکاری خۆ"بێنێتە بەرـ هەم کەقەت نەچێتە ژێرباری ئیرادە وخواستی بێگانە و تێ بگا وتوندوتۆڵ وبوێربێ وبیروباوەڕی خەللاقی هەبێ ، دەبێ بەیەکجارەکی "لێدان " لە رێزی رێگاکانی تەربیەت کردن هەڵاوێرین وبەدەخۆڕادیوی بێژین :

**"ئیتر لێدان بۆ هەمیشە قەدەغەیە".**

لێئۆپۆلد سێدار سینگۆر ، سەرەک کۆماری سنیگال،یەکێکە لەبەناوبانگترین شاعیرەکانی ئەفریقا .

ئەو شاعیرە پایەبەرزە لایەنگری گەڕانەوەیە بۆ سەر داب وشوێن و فەرهەنگی ئەفریقایی ولەوەڵامی رەشەکانی ئەمریکادا کە خۆیان بە غەریب دەزانن و هەمیشە دەپرسن :

ئێمە کێ ین؟ لە کوێوە هاتوین ؟ بۆکوێ دەچین ؟ فەرهەنگی ئەفریقایی دەخاتە بەرچاو.

بەواتەی نووسەرێکی فەرانسەوی "لە شیعرەکانی سێدار سینگۆردا دەنگی رمبەی تەپڵی ئەفریقامان بە گوێ دەگا!"

نموونەی شیعری سێدار سینگۆر:

# تۆکۆوالی

## وەرگێڕ: قازی ئەحمەد

ئەو شەوانەت لەبیرماون کەبە کوڵتەوە خەو
دەیبردمەوە ؟
لە بیرت ماوە دەستمت دەگرت و لەئەنگوستە
چاوی شەوەزەنگدا رێگەت پیشان دەدام ؟
هەموو جێگا یەک بێ دەنگە .
تەنیا شەپۆلی بۆنی پنج وقۆپەن وزەمزەمەی
هەنگی خەنە رەنگە کە بەسەر لاوکی سریلەکا-
ندا زاڵ دەبێ .
دەنگی کزی "رمبە رمبی "تەپڵی دوورەدەستە
کە نەخشی شەوگارە .
تۆکۆ والی ئەوەی نەت بیستووە دەیبیسی
ئەو شتانەی کە باب وباپیرەکانمان لە
زەنوێری ئۆقیانووسدا باسیان دەکرد بۆم
بگێڕەوە :
گا ،دووپشک،پڵینگ ،فیل ،ماسی ،رێگای بێ
پسانەوەی کاکەشان وسەرەنجام
نووری مانگ کە بە هێزی خوا پێداوی پەردەی
رەشی شەو هەڵدەدرێ .
چەند جوان لەگەڵ تەپۆڵکەکانی لێک دەهاڵێی
ئەی جوانی کەونارا ، ئەی ئەفریقای ئێسک
سووک .
ئەی روخساری نێوچاوان زەقی ،چەناگەخڕی،
چاو رەش .
ئەی خەتی رێک وپێکی روخسار .
ئەی مێ یە شێری من .رەشی دەلرفێنی من .
شەوی رەشی من .رەشی رووت وقووتی من.
ئاخ ! کە زۆرجار دڵی منت وەک پڵینگی
وەحشی ناو قەفەسی تەنگ وەخۆ ختووە .
ئەی شەو کەمنت لەچەڵتەی کۆڕومەجلیسان
لە بیانوو، بۆڵەی ترسەنۆکان
لە رق ئەستووری وخوێن خۆری خوێنمژان رزگار
کردووە .
ئەی شەو ، هەموو دژایەتی یەک لە مندا
دەتوێنیتەوە .هەموو جیاوازی یەک لە
یەکێتی "رەش بوون" دا لەناو دەبەی .

ئۆستا تۆفیقی مەحموودی کوڕی مەرحوومی برایمی جافە .مانگی رەشەمەی سالی "١٣٠٢" ی هەتاوی لە گوندی " هۆزی خولە"یا " دێی خوا مرادبەگ " لە دایک بووە .ئەم گوندەکەوتۆتە هەرێمی ئێلی گەورەی جافی وەلەد بەگی ناوچەی جوانرۆ .

گوندی هۆزی خولە لەسەردەمی دەسەلاتداری باوکی ئەورەحمان بەگی وەکیلدا بە دەستی خوامراد بەگ کە لە دایکەوە دەبێتە پشتی پێنجەمی ئۆستا ، ئاوەدان کراوە .

هەرەتی مندالی ومێرمندالێتی ئۆستا هەر لەم گوندە تێپەڕ بووە .

سالی "١٣٠٧"ی هەتاوی، باوکی کۆچیدوایی دەکا . باپیری بەناوی"محەممەدی چراچاوەش" کە چراچاوەشی سەرداررەشیدخانی ئەردەلان دەبێ، ئەرکی بەخێوکردنی خێزانیان وەستۆ دەگرێ .

وەک دەلێن محەمەدی چراچاوەش شاعیرێکی باش بووە .بەلام بەداخەوە شیعرەکانی وەک زوربەی ئاسەوارە بەنرخەئەدەبی یەکانی کوردی لەنێو چوون وفەوتاون .

چراچاوەش وشەیەکی تێکەلاوە ، لە"چرا" ی کوردی و"چاوەش"ی تورکی پێک هاتووە .

"چرا" کەرستەیەکی رووناک کەرەوەی وەک لامپا و پیوسۆزە ، هەر وەها کینایە لە چاویشە. " چاووش" بە تەپلچی وشایەر یا سەرۆک وپێشەنگی لەشکر وکاروان دەگوترێ .

"چراچاوەش" بەسەر یەکەوە یانی ئالاهەلگر، سەردازی سپا یا چاوی سپا .

محەمەدی چراچاوەش هەولێکی زۆری بۆ

پێ گەیاندنی ئۆستاداوە وهەستی خۆشەویستی شیعری خستۆتە دڵیەوە. چون لەو سەردەمەدا ناوچەی جوانڕۆ قوتابخانەی نەبووە وخوێندن لە حوجرەدا باو بووە،ساڵی "۱۳۲۰" لە تەمەنی ۱۸ ساڵیدا دەینێرێتە گوندی "بروارە-ین" .

ئۆستا بۆ ماوەیەکی کەم لەم دێیەدا لە مەحزەری مامۆستایەکی کوردی تورکیا بەناوی "مەلا زوودی" دەرس دەخوێنێ .دوای فێربوونی خوێندن ونووسین ،سەبارەت بە بژێو بە نابەدڵی حوجرە بەجێ دێڵێ ودەڕوا بۆ جوانڕۆ.

دیارە مەعاش پەیداکردن نەیتوانیوە دەستی پێ لە شیعروشاعیری هەڵگرێ بەڵام خۆی گوتەنی لەو سەردەمەدا شیعرەکانی کاڵ وکرچ، بوونە وچێژێکی وایان نەبووە .

پاش ماوەیەکی کەم لە جوانڕۆڕا دەچێتە وەڵەدبەگی ولەوێ دادەمەزرێ .هەر لەوێش شیعری کەلە شاعیری وەک نالی ومەولەوی و خانی دەناسێ.

شیعرەکانی پێشوویدەکاتە دەستە چیلەی ئاگر وسەرلەنوێ ئەسپی قەڵەم بەرەو هەواری باسەفای شیعر داژوێ .

ئەوجار دێتە "ڕوانسەر" ودوای ساڵەوەختێک لە ساڵی "۱۳۳۶"ی هەتاویدا دەچێتە شاری سنە .لە قەراغ خەیابان بۆتکەیەک دادەنێ و دەست بە توتن وسیغار فرۆشتن دەکا .

ساڵی "۱۳۳۸" لە شاری سنە ژن دەخوازێ و هەر لەوێ بنەگر دەبێ .دوای ژن هێنان دوکانێکی بەققاڵی دەکاتەوە .

ئەوەندەی پێ ناچێ دوکانەکەی دەبێتە مەکۆی ئەویندارانی شیعرو ئەدەبی کوردی . زۆرجار بەدزی یەوە ئەدەبدۆستان لە دوکانەکەیدا کۆبوونەتەوە و شیعریان بۆ یەکتر خوێندۆتەوە .بۆخۆی دەڵێ :

«قەت لە هێرش وگەفی ئەمنیە دڵڕەقەکانی حەمەرەزاشا نەدەترساین».ئەمجار لەدوکاندا-ریش دەست هەڵدەگرێ وکارگایەکی ناسککاری دادەمەزرێنێ .

دەسکردی ئەو لەقوتووە سیغارو گۆچان و شەترەنج بگرە تا نەرد،لە هەموو شاری سنەدا نێوبانگ دەردەکەن وکاک تۆفیقی دوکاندار دەبێتە "سوا"تۆفیقی هونەرمەند .

"سوا" لە زاراوەی سنەییدا بە مانای "ئۆستا"یە . هەر لەو کاتەشەوە ناز ناوی "ئۆستا"هەڵدەبژێرێ وهونەری هەست ودەستی دەنگ دەداتەوە .

ڕۆژێک لە کاتی کارکردندا ئەمدوو بەیتە شیعرەی بۆدێ ،چون دەفتەری لەلا نابێ لە دیوی ژێرووی ئەومیزەی کاری لە سەر دەکا دەینووسێ .

**چەمەکەم چەمان چەمەڕای راتەن**
**موژەم جاڕوو کێش گەرد پالاتەن**
**هێمای دیدەکەت دڵ نەدیدەم بەرد**
**گۆشەی چەمەکەت جەسەم کەردوەگەرد**

پاش تەواو کردنی میزەکە لە بیری دەچێ شیعرەکە پاک بکاتەوە وهەر وەها دەینێرێ بۆ خاوەنەکەی کە دوکتۆرێکی بە ناوبانگی کورد دەبێ .دوای چەند ڕۆژان دوکتۆر بە هەڵکەوت چاوی بەو دوو بەیتە دەکەوێ. بە پەلە خۆی دەگەیێنێتە کارگای ئۆستاو داوای لێ دەکا ئەو دوو بەیتەی بۆ لەسەر میزەکە هەڵقەنێ ......

ئۆستا تۆفیق بە هەورامی وسۆرانی وو کەڵهوڕی و لەکی شیعری داناوە. زوربەی شیعرەکانی لە سەر کێشی خۆماڵین.بەڵام لەسەر کێشی عەرووزی وبە شێوەی کلاسیکیش غەزەل ،

قەسیدە ،مەسنەوی ،تەرکیب بەند ، تەرجیع بەند ، **چوارینە** ،رووباعی ،دووبەیتی و قەتعەیە**کی زۆری** هەیە کە تێکڕا حەوت دەفتەریان لێ پێک دێ .

لەم حەوت دەفتەرە دەفتەرێکیان بەناوی "گوڵی ئاوات" ئای بی ئێم ،کراوەو خوایاربێ بەم زوانە دەچێتە ژێرچاپ تا ئەدەبدۆستی کورد کەلکی لێ وەربگرن .

شەش دەفتەرەکەی تریش ،سێیان سۆرانی ، دوویان هەورامی ویەکیشیان کەڵهوڕی یە و هێشتا لە چاپ نەدراون .

روون خستۆتە بەرچاو . جاری واشە رچەی شکاندووە وقالبێکی نوێی هێناوەتە گۆڕێ کە جێی سەرنجە وەک ئەو شین گێڕی یەی کە لە سروەی ژمارە پێنجدا چاپکراوە .

تایبەتیەکی گرینگی دیکەی شیعری ئۆستا هێنانەوەی هێندێک وشەی جوانی ئێل وتایفەکانی جاف ولەکی یە کە زۆرجار جێگای خاڵی بەعزە وشەیەک پڕ دەکەنەوە وجوانی یەکی تایبەتی دەدەن بە شیعر .

دوو بەیتی یەکی زۆری بە هەورامی وسۆرانی و لەکی داناوە کە ئەمەش نموونەیانە :

"گوم کەردە"

هەوار خاڵیەن هەوار خاڵیەن
یاگەی رەشدەوار ئارۆ خاڵیەن

های های هەم جە نۆ ئێش و تاڵیەن
کۆ کەوتەن ئازیز بەختبەتاڵیەن

قافڵەش جە قوڵەی کام کۆسار ویەرد؟
هەردو بەردەکەش سووچۆ بۆ وەگەرد

جە کۆ هۆرشدان یانە تازەکەش؟
کۆ گێلۆم نە شوێن رێزەی رازەکەش؟

شنەی کام ئێلاخ شاناش دوور کەوتەم؟
لێڵا و حەسرەتش مەکێشۆم وە چەم؟

هاوار چەمەکەم کام سەر سەراوەن؟
نەکام مێرگۆڵان کام لارە کاوەن؟

کۆچش وە قوڵەی کام قاف رەوکەردەن؟
پاسە دڵ و دین جە کەفم بەردەن

یاران سا دەخیل ،هاوفەردان ،خێڵان
پیم واچان مەکۆ و گوزەرگای ئێڵان

تێشەی فەراقش نیان ژە فەرقم
وە مەودای تێشەش نە هوونا و غەرقم

جەزبەی ئەشق لەیل مەجزووبم کەردەن
تەوق مەجنوونیم وزۆن وە گەردەن

کۆمار ژە ناڵەی ئێشم بێدارەن
پۆشان سپیدی روخسارم دیارەن

هەی هەی جە ناڵەی سۆسۆی دەمەی ئێش
وەی وەی نە لافا و چەمان هیجران کێش

دەی دەی ژە قوڵپەی قازانەکەی دڵ
مەدۆن وە هەمدا هەزاران موشکڵ

های "هۆسا" پەیوەن ئونس و ئینسانی
هۆرتدان نەتۆی جەفا و زەمانی

کێ یاوان وەکام گوم کەردەکەی ویش
رەنگا رەنگ ئێش بەیان کەرۆ پێش

ئۆستا لە شیعرەکانیدا پتر سەهلی مومتەنیعی رەچاو کردووە و زۆر بابەتی عیرفانی کۆمەڵایەتی ،سیاسی ،خۆشەویستی و جوانی یەکانی دیمەنی کوردەواری بە زمانێکی ساکارو

هەورامی :

هەر ساتم ساڵەن خەم خەرمان خەمەن
یاگەت خاڵیەن ئەنجمەن کەمەن
تراویش چەمان چەمانم چەمەن

وارگەم مەنزلگای تراژێد تەمەن
سۆرانی :
رووبەندی لەسەر باغی بەی لادا
بسکی بەرەزای رژا بە پادا

گوڵ دەستەی شەفەق دەمی کردەوە
ئۆستاش لەو بۆنە خەوی بردەوە
لەکی :
دەس منەت مەکیش وە حاتەم تایی
سەرت خەم نەکەی ئەڕای گەدایی
دەس شەکەت وەسەر دڵەی سیر دانە
وە وەرت مەکە رخت ریایی

ئۆستا تۆفیق تەمەنی گەیوەتە ٦٣ ساڵی . سێ کوڕ وچوار کچ وپێنج نەوەی هەیە . بەو حاڵەشەوە زۆر باش ماوە وکارگاکەی لەشەقامی شوهەدای جنووبی سنەدا ئێستاکەش مەکۆی ئەویندارانی شیعرو ئەدەبی کوردی یە .

"وەڵگەرێزان"

کۆس کەوتە و پەشێو یاگەی هەواران
بنەکدار قافڵەی خەجاڵەت باران

دڵ پێکان تانەی سەبا و ئێواران
مەعزوور جە حوزوور دیدار یاران

عومرم هەر ساتش وە ساڵان ویەرد
سۆچام هەی سۆچام جەسەم بی وەگەرد

کلێڵەی خەمان شین جە تۆی فەرقم
مەیل وە مەی مەردەن شەتاوان غەرقم

دڵ نیام ژە کەف تەرازووی خوێشان
کول لوان وێم مام پەی حەسرەت کێشان

مشتاق وە مەردەن وێنەی ئازیزان
وەهار مەیل مەدۆم وە وەڵگەریزان

پای زەورەق نیشتەن نە بەحر قوسوور
کەرەمدار ساحل منهانا جە دوور

هانا غەواسان دەریای شەفەقەت
با نجاتم بۆ جە مەوج مەشەقەت

نەوا ئەقڵ و هۆش کۆچ کەرۆن نە لام
خەڵوەت بۆ یاگەی مەعریفەت و فام

شەجەرەی ئولفەت بدۆم وە تالآن
وێنەی جڵۆدار جەفا بە تالآن

" هۆسا " پای سفرەی ئینسانیەت دڕیان
دەست جە وەرێس بەشەری بڕیان

قافڵەت جە کاروان ئاوات مدۆ لەنگ
رەنجت بابەردەن سەر بدۆی وە سەنگ

هەر چێش و یەردەن عومر بێ حاسڵ
ساحێو عەقڵ و فام کەی مەبۆن خجڵ؟

ناڵە ناڵتەن کەم هەراسان بۆ
سا بۆ ئاوێتەی حەق شناسان بۆ

**پاشماوەی ڕێبازی ...**

بەم جۆرە، ئەم بیرکردنەوە تازەیە لە قەڵەمڕەوی ئەدەب وهونەریشدا، یانی لەنێو شاعیرو هونەرمەندەکانیشدا بڵاو بووەوە و ڕەنگی دایەوە. زوربەی ڕەخنەگرەکانی مێژووی ئەدەب، پەیدابوونی ڕێبازی ڕۆمانتیک ئەوها لێک دەدەنەوە کەباسمان کرد، واتە هۆیەکی دەبەنەوە سەر سەرهەڵدانی چینی تازەی سەرمایەدار وبازرگانان.

لەگەڵ ئەو خەلێ شێوان وهەرەس هێنانەی ڕژیمی دەرەبەگەکان وسەرهەڵدانی بازرگان و سەرمایەداران، هونەرمەندوقەڵەم بەدەستی تازە پەیدابوون کە دەیانەویست بەبیرو بڕوایەکی تازەوە، بەڕێبازێکی نوێ وسەربەخۆی جیالەئی کلاسیکاندا بڕۆن. شتی ئەوها بنووسن کەگەڵ ئازاروکوێرەوەری وپەژارەی هەموو خەڵکەکە یەکتر بگرنەوە، نەک هەر تایبەتی دەستە وتاقم وچینێک بێ. دەیانەویست ئەدەب وهونەر چیدی بۆخزمەتی "ئەقڵی باو" وبۆ خزمەتی دەستووری دەسەڵاتداران بەکار نەیە، بەڵکوو لە پێناو "ئازاکردن" و "ئازادکردن"ی ئینساندا بێ، لە پێناو پەروەردەکردنی دەروون ورووحی مرۆڤ وپێشکەوتنیدا بێ و مرۆڤ سوود وچێژوجوانی لەو ئەدەب وهونەرە ببینێ. هەربۆیەش یەکێک لە سفەت وتایبەتی ـ یەکانی ئەم ڕێبازە ئەوە بوو کە ئەدەب و هونەرەکەیان سادە وبێ گرێ وگۆڵ بوو. سیمایەکی نەتەوەیی هەبوو، پڕبوو لەجۆش و خرۆش وهەستی ئینسانی وسۆزوغەم وکەسەر!

بەم شێوەیە، هەرلەگەڵ سەرەتای شۆڕشی سەنعەتی لە ئینگلیستان وپەیدابوونی چینی بۆرژوا ولەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی گەورەی فەڕەنسە بە دژی دەرەبەگان، ڕێبازی ڕۆمانتیک پێشان لە ئینگلیستان وپاشان لە فەڕەنسە بە یەکجارەکی ڕەگی خۆی داکوتا و وردە وردە گەیشتە ئاڵمان و بەدوایدا گەیشتە ئیسپانیا وڕووسیەش. لەساڵی هەزاروهەشسەد و پەنجاش بەملاوە بەسەرانسەری ئورووپادا ولە هەموو بوارەکانی شیعروچیرۆک وڕۆمان و شانۆنامە وڕەخنەنووسیندا، تەنانەت لە بواری، وینەگەریش بڵاو بۆوە.

ڕێبازی ڕۆمانتیک لە فەڕەنسەدا لە ژێر تەئسیری ڕۆمانتیکی ئینگلیستان سەری هەڵداو برەوی سەند: کاتێ کە "شاتوبریان"ی شاعیری ڕۆمانتیکی فەڕەنسە، بەرهەمی شاعیرە ئینگلیسی یەکانی کردە فەڕەنسی، ئەم بەرهەمە ڕۆمانتیکانەی وەریگێڕابوون، سەرنجی خەڵک ونووسەرانیان ڕاکێشا ووایان کرد کە نووسەری فەڕەنسیش بە هەمان شێوە ولەسەر هەمان ڕێباز بنووسن. هەر لەو سەردەمەشدا بوو کە شاعیری فەڕەنسی وەک "ویکتۆرهۆگۆ" "شاتوبریان"، "لامارتین"، "ئەلفریددی ڤینی"، "ئەلفریددی مۆسە"، "جۆرج ساند" و "مادام دووستاڵ"، کتێب ونووسراوەکانی خۆیان بە

لێشاو بڵاو کردەوە ."شایانی باسە کەئەم نووسەرەی لەئاخر ناوی هاتووە ، ژن بووە ، ڕێز وناوبانگی ئەو ئەگەر لە ی پیاوەکان زیاتر نەبێ ،کەمتر نیە " .

هەر بۆیە دەبینین لەوسەردەمەدا-بیست و پێنج ساڵەی دوایی سەدەی حەڤدە-پێنج "فەرهەنگستان" ولەنیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەشدا بیست فەرهەنگستان دامەزران هەروەها ژمارەی ڕۆژنامە وهەفتەنامە و گۆواری ئەدەبی لەوێ ولە ئینگلیستان ولە وڵاتی دیکەش ،زۆرتر دەبوون وبایەخیان زیاتر پەیدا دەکرد ولەنێو خەڵکدا بەجۆش وخرۆشتر بڵاو دەبوونەوە .چونکە شاعیرونووسەر و هونەرمەندەکان لە عەوامی سادە بوون ،لەبە چین وتوێژی جیاجیای میللەت بوون ، لە نووسین وهونەرەکەشیاندا ،قسەیان لە بارەی ، مرۆڤی چەوساوە وخەفەتباری وەک خۆیان دەکردولە گیروگرفت وژیان وچارەنووسی مرۆڤ دەدوان .

نابێ ئەوە لەبیر بکەین کە هەندێ ڕووناکبیر وفەیلەسووفی وەک "ژان ژاک ڕۆسۆ"" ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە بڵاوکردنەوەی بیری ئازاد وبیری ڕۆمانتیکی وکتێبەکانیان بەتایبەتی کتێبی "بەندی کۆمەڵایەتی " و "ئیعترافات" زۆری کارلە هونەرمەند و شاعیرەکان کرد .تەنانەت درۆ نیە ئەگەر بڵێین : هەموو شاعیرێکی ڕۆمانتیکی ئەو سەردەمە کەوتۆتە بەرتەئسیری کتێبەکانی ژان ژاک ڕۆسۆ .

**سیماوتایبەتی یەکانی هونەری ڕۆمانتیک "**

پێویستە بزانین کە ڕێبازی ڕۆمانتیک لەبەینی دووقۆناغدا هاتۆتە ئاراوە ، لە لایەک ئەوکاتەی کە چینی دەرەبەگ و دەسەڵاتداری "نەجیب زادە" لەحاڵەتی هەرەس هێنان وشپرزەبووندا بوو ،لەلایەکی دیکەش ئەوکاتەی کە چینی بازرگان وسەرمایەدار تازە دەگوورا وشێوەی ژیان بەرەوئاڵۆزتربوون دەڕۆیشت .بۆیە ئەدەب وهونەری ئەو ڕۆمانتیکانە ئاوێنەیەکی بێ گەردی ئەوسەر-دەمە دیاری کراوەیە.

ژان ژاک ڕۆسۆ کەوەکوو گوتمان دامەزرێنەری بیری ئازاد وبیری ڕۆمانتیک بوو ،لە کتێبەکانیدا پێشنیهادی دەکرد کە مرۆڤ بگەڕێتەوە باوەشی تەبیعەت :بگەڕێتەوە ئامێزی ئارامی وهێمنی وئاسوودەخەیاڵی ، بۆ ئەوەی‌لەدەست شەڕوگێچەڵ وناخۆشی یەکانی ئەم ژیانە ئاڵۆزو تازەیە ڕزگاربێ ،بۆئەوەی لە ئامێزی ئەم تەبیعەتە پاک وخاوێنەدا ، مرۆڤ سەرلەنوێ رووح ودەروونی خۆی بەشێوەیەکی جوان ،دروست بکاتەوە ومەزرای هەناوی خۆی بەئاوی جوانی وهەستی پاک،پاراوبکا . ئەم بیروبۆچوونەی ڕۆسۆ لەنێو بەرهەمی هەموو شاعیروچیرۆک نووسەکان ڕەنگی دایەوە .

نووسەری ڕۆمانتیک ،هەریەکە بەشێوەیەک ناڕەزایی ویاخی بوونی خۆیان لەدەست ژیانە ئاڵۆزەکە دەردەبڕی : هێندێکیان وەسفی بەدبەختی خۆیان دەکرد وبەتەنیایی و گۆشەگیری خۆیان هەڵدەگوت وناهومێدی و هەستی زەبوونی وبێچارەیی خۆیان دەردەبڕی وەکوو"جورج ساند" کە دەیگوت : ئێمە بەرەیەکی بەدبەختین ، هەربۆیە ناچارین بە درۆکانی هونەر ،خۆمان لە دیاردەکانی ژیان دوور رابگرین .هەندێکی دیکەش پەنایان دەبردە بەرگەشت وگەڕان وسەفەرکردن ،سەری خۆیان هەڵدەگرت و ڕوویان لە وڵاتی

بڕوانە لاپەڕەی ٧٤

ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی

# کاکە میر و کاکە شێخ

هەی رۆ.. هـۆ ...هـۆ... وەی
ئەستی دەلـێ خوشکێ بەغدانێ
سەرشینی قەلەندەری بابان وێرانێ
بێ کەسی ،بێ دەری ، بێ خودا نێ
وەرە یەکمان بچینەوە ئەستەمبوولێ
یەکمان بچینەوە کن شازادە شای تارانێ
یەکمان بچینەوە کن خلیج باتمانی دە ئیسپەهانێ
ئەوی دیکمان بچتەوە کـــن شـــــازادەی
دە شووشوانێ

دە با بچینەوە سەر کوو پەڵەی دە خمخمانێ
ئەتۆ لێدە وەلکی دە دەسرۆکەی
ئەمیش لێدەدەمەوە لکی دە کۆلوانێ ناوەڵڵا
دەلاملانـــێ
ئەمن داخێک و سێسەت مخابەتی دە دنیایـەم
دەگــوژی
بۆ کاکە میر و کاکە شێخم
حاکمەکەی مەرگە و پشدەری رەنگینم کوانێ
هەی رۆ... کاکینە رۆ... براینە رۆ

ئەگەر راستە   ئەگەر درۆ
وەسەری ئەستی قەلەندەروو دەکرد خۆڵی کۆکۆ

* * * *

هەی رۆ... هۆ... هۆ... وەی
ئەستی دەڵێ خوشکێ بەغدانێ
سەرێ من دێشی دلێ من چەندی لە غللوورە
خۆمن دەچوومەوە هۆدە و دیوەخانی
کاکەمیر و کاکە شێخان لێی رادەخرا
چەند قالیچە و سەرئەندازوهەرامەتی مافوورە
لێی دادەندرا سەرین وموتەکا دەستوور بە
دەستوورە
لێی دادەنیشتن چەند میر و بەگلەر
دەستوور بە دەستوور، جەمبوور بە جەمبوورە
خۆمن دەچوومەوە یەختەرمەخانەی کاکە میر و
کاکە شێخان لێی دەبەستراوە کوێتی قاپ
رەش و کۆی دە خورمایی
پێشبەند و پاشبەندیان لە ئاوریشمی سوورە
هەموو لەسەر خۆیان دادەماڵی و فرێ دەدا
رەشمە و توورە

لە بنی گوێ یانم خۆش دێ
پرمەی بۆروبدەوان دەگەڵ سەدای پیرەسازی
خۆ ئەمن زەینی خۆم دەداوە
بەر دەرکی دیوەخانی کاکەمیروکاکە شێخان
ئەوە برای من سوار دەبوون
دەیانکردەوە بە تەقڵە و رمبازی
ئەورۆکانە کەوتوونەوە بەراوی ورچ وبەرازی
گۆشتیان لێدەگرن بە مووکێشی
هەرامەتی هەر بە گازی
یارەبی«ئاو دەل گۆران» بۆت بەرێ بێ
تیرەکەی دە حوسێنی غازی
هەی رۆ...کاکینە رۆ....براینە رۆ...
ئەگەر راستە   ئەگەر درۆ
وەسەری ئەستی قەلەندەروو دەکردەوەخۆڵیکۆکۆ

* * * *

هەی رۆ...هۆ...هۆ...وەی
سەرێ من دێشی،دلێ من چەندی لە غروورە
ئەمن لە بنی گوێیانم خۆش دێ
پرمەی بۆروبدەوان دەگەڵ سەدای پیـــرە

هەی رۆ... کاکینە رۆ... براینە رۆ
ئەگەر راستە   ئەگەر درۆ
وەسەری ئەستی قەلەندەروو دەکرد خۆڵی کۆکۆ

* * * *

هەی رۆ...هۆ...هۆ...وەی
ئەستی دەڵێ خوشکێ بەغدانێ
سەرێ من دێشی دلێ من چەندی لە تازی

سەمتوورە
خۆ ئەمن سبحەینێ هەڵدەستام لە خەوێ
دەمروانی یە وەتاغ و باڵەخانەی کاکە میرو
کاکە شێخان
نە دەنگی فەراشی دێ ، نە دەنگی نۆکەران
نە شەقەی سەماوەرێ،نە تەقەی ئیسکانی بلوورە
تو خوداکەی خزمینە

«رووتەڵە»

# تاوانبار!؟

## تەنزی کۆمەڵایەتی

دوو دۆستم هەن ئێستا لێم لالووتن.من هیچ لە خۆمدا شک نابەم ،ئەوان کێردم لێدەسوون. هەڵبەت لەوانە نین کە نەیناسن چون لەمێژە دۆستین و زۆرمان سارد و گەرمی رۆژگار چێشتووە. دەورەی رژیمی شایەتی هەر سێکمان ئەندامی دەستەیەکی دژی شا بووین،هەر لەوێ یەکترمان ناسی و خوومان بە یەگدی گرت.

هیچمان لێک نەدەشاردەوە و هەموو لەسەروسرِی یەکتر دەگەیشتین بەڵام رازی یەکدیمان ببرای ببر لەلای کەس نەدەدرکاند و هەر ئەمەش ببووە هۆی دۆستایەتییەکی قایم و پتەو لەنێوانماندا.

هەمیشە بەیەکەوە بووین. نانمان بێیەک نەدەخوارد.من دایکێکی پیرم بوو خوالێی خۆشبێ لەگەڵ مردووی ئێوە سەوادی نەبوو بەڵام بەقسەی خۆی تاڵی و سوێری زۆر چێشتبوو و سەری قسەتکردبا لەبنی حاڵی بوو.

دایکم هەمیشە دەیگوت:

ـ رۆڵە مەردی خودا بە کەست لە سیاسەت هەڵ بگرە ئاخر دەگەڵ ئەو دوو سێ دمرووتە رۆژ هەتا ئێوارە لەم دیوە دادەنیشن و دەخوێنن و دەنووسنەوە، بۆ چی؟ کورم هەر ماران بە دەستی خەڵکی بگرە ،من دەزانم هەر ئەوانەی ئەمرۆ چەپڵەت بۆ لێدەدەن سبەینێ لێت لە هەڵڵا دەدەن ، کورم " کە گلۆڵەت کەوتە لێژی کەس چاکەت نائێژی".

دەمزانی ئەو خەمی منیەتی و پێی خۆش نیە لە هەل و مەرجێکدا کە کەڵ بە موو بەندە تووشی گێلمەگێلم بم ،بەڵام من رێگەی خۆم هەڵبژاردبوو،سەریشم دانابا دەستم لێ هەڵنەدەگرت.

جابۆیە هەمیشە کێشەمان بوو ،قسەی خۆمان بێ لەبەر ئەم هۆیانە دایکم ئەو دوو دۆستەمی خۆش نەدەویست. ئەوانیش ئەوەیان دەزانی بەڵام سیاسەت لە لایەک و دۆستایەتی لە لایەکی ترەوە ئەم کۆسپە بچووکەی لەنێو خۆیدا ون کردبوو.

رەنگ بێ کەم کەس بروا بکا کە چۆن ئەم دۆستایەتییە دەتوانێ بشێوێ چ شتێک دەتوانێ ئەم سێ دۆستە لێک بکا؟

وردە وردە کارەکەمان تەنەوەی دەکرد.ئەمجار دەوڵەت لێی وەخۆکەوت. رۆژ نەبوو ،یەک و دوومان لێنەگرن و بێسەروشوێنی نەکەن. منیش لەم نیعمەتە! بێبەش نەمام و بەشی خۆم پێ برا.

رۆژێک لە خیابانێ دەگەرام.کاغەزێکم بەدەستەوە

بوو .دەبوو شت بکرم .لەوەتی وەدووی سیاسەت کەوتبووم کاروباری خۆم لەبیر چووبووە و ئەگەر لەماڵ پێویستمان بە ئیسووت و زەردەچێوە بووبا ، لای خۆم لێکم دەداوە بزانم لەکوێوە دێ و چۆن ساز دەکرێ و کێ دەیفرۆشێ. جا ئەگەر بە دڵم بایە دەمکری دەنا لەخۆم حەرام دەکرد و دایکی چارەڕەشم شۆربا و کفتەی بێ ئەدوا لێدەنا .

پاش سووڕ و خولێکی زۆر و لێکدانەوەیەکی سیاسی ! هێندێکم کەل وپەل کڕی وبەرەو ماڵ بوومەوە .لە رێگا لەندەوێرێکی بۆر لەبەر دەمم راوەستا و دوو پیاوی فیلەنتەری لێ دابەزین و گوتیان :

– سواربە !

– بۆ کوێ ؟ راوەستن بزانم ئێوە کێن ؟

– دوو پرسیارت لێدەکەین و ئازادت دەکەین.

هەرکە ئەم رستەم بیست زانیم ساواکە و جێی خۆ خافڵاندن نیە ئەگەر زۆری قەراغ لێ بکێشم کارەکە پووچەڵتر دەبێ.هەر بۆیە ملم دا . یەکیان نەقورچێکی تێ سریواندم و بە دەرگای پشتەوەدا دەماشێنەکەی هاویشتم .ماشێن ویرەیەکی لێهات و بە ناڵەناڵ وەڕێ کەوت .

کابرای تاین دەتگوت ماڵی ئێمە جێی ئێوارەوسەیرانیەتی سەربەخۆ بۆلای ئەوێ چوو . لەبەر دەرگا رای گرت.یەکیان دابەزی دەرگای پشتەوەی کردەوە منیان دابەزاند و وەپێش خۆیان دام .

دایکم هەرکە ئەوانەی دی لە دوورەوە بەرەو پیریان هات و بەخێرهاتنێکی گەرم و گوڕی کردن بەڵام متەق لە داروبەرد بێ لەوان نەهات. ئەگەر دەسەڵاتم بوایە لەوێ دەمخنکاندن.ئاخر ناتوانم بڵێم کە دایکی چارەڕەشم چەند بەخۆیدا شکاوە .

لەتاوان بۆخۆم وەقسەهاتم و گوتم :

– دایە گیان ئەوانە پیاوی دەوڵەتن .

دایکم وەک مار پێوەی دا بە بیستنی دەوڵەت پردی قیامەتی پسا و بۆخۆشی لە خۆی حاڵی نەبوو دەڵێ چی!. لێوە بێددانەکانی دەلەرزین و چاوی بە مۆلەق وەستابوو.

گەیشتینە بەردەرگای دیوەکەی من و ئەوان وەپێش خۆیان دام .

دایکمدیسان وەقسە هاتەوە و گوتی:

– سەدجار بە قەبری ئەو جوانەمەرگەی برام! کوڕی من هیند ساویلکە و گێل و ماڵ وێرانە بە کەچکە ئاوێکی وەمەلە دەکەوێ و بە بارەقەڵایەکی ئەستۆی خۆی دەشکێنێ ! ئاغای رەئیس دەبەرت مرم....

دەستی کرد بە گریان و خۆی پێڕانەوەستا . وادەکرووزاوە بەردی دەتواندەوە .

– ئاغا نازانی چەند بە کوێرەوەری کوڕم گەیاندۆتێ!

– خانم خۆ نایخۆین.چمان لێ نەکردووە .ئەوە نیە کوڕەکەت لەبەر چاوتە .

– دەباشە باشە بەقوربانتان بم! دەسەرتان گەڕێم....

دایکم هێندێک ئەهوەن بۆوە .لەپشت ئەو وەتاغەی لێی راوەستابووین خەڵوەتی- یەکمان بوو کتێب و شتی خۆم لێ شاردبۆوە .پەردەیەکیشم پێوەگرتبووە تا دیاری نەکا . زانیم تا ئێرە تەواو رزگاریم بووە و ئەوان فکری خەڵوەتیان نەکردووە کەچی لەپڕ یەکیان پەردەکەی لادا و سەنەدی جینایەت !وەدەرکەوت

پێتان وانەبێ ریس و گوریسی دنیام لەلابوو .تەنیا تاوانم راگرتنی کتێبی کوردی بوو ،بەڵام ئەگەر راستیت دەوی لەتۆپ و تانکیش قەدەغە – تر بوو .کتێبی کوردیان کە لە کەسێک دەگرت هیچ پێویست نەبوو کەس بپرسێ بۆ گیراوە ،جا نەخوازە لە هەندەرانیش هاتبا !

بەڵێ من ئەوەی لێی دەترسام وەرێم هات و ئەو کتێبانە بەس بوون بۆ جزیادانم . کابرا کە چاوی بە

کتێبان کەوتە سەرێکی ڕاوەشاند و مۆرەیەکی لێکردم پەردەکەی بە بزمار داکرد و دەستی کرد بە پشکنین. هەر کتێبێکیان وەلادەنا هەردووک وێگرا دەیانگوت!

ـ بەه بەه! ئەوەتا ... ئەوەی دەڵێم.

دایکیشم لەسەرەخۆ دەیگوت:

ـ ئەوانە خۆخراپ نین!

ـ نەخێرخانم بۆ خراپن؟

ـ بەڵێ کوڕی منیش وادەڵێ! ئاخر تائێستا هیچ درۆم پێوە نەدیوە .سەری بچێ نوێژی ناچێ! بەخوودای ئەوەندە بەحەیا و بەئەدەبە خەڵک ئاواتی بۆ دەخوازێ.

ـ بەڵێ دیارە !لەوانەیە دەوڵەت جایزەشی بداتێ.

ـ نۆکەرتانە! بەسەری تۆ ئاغای رەئیس زۆر لەمە وشیارتر بوو بەڵام هەتیو مەتیو هێندیان لە گوێی سریواند و چوونە بن پێلی ئەوەی دەشی زانی لەبیری چۆوە.

چاوێکم لە دایکم کرد کە بێدەنگ بێ بەلام ئەو هاوڕازی وای وەگیرنەدەکەوت دەردی دلی بۆ بکا وەسەری کردبوو نەیدەماڵییەوە.

ـ بەڵێ ئەری وەڵڵا! کوڕم دەتگوت منارەیە ئەوە باوڵەی باسکی بوو .چاوی لێ بکە ئێستا دەڵێی چەڵەکەیە، بێ عەینی دەڵێی ماران مشتوویانە .ئێسک و پێستەکە نەبێ نەیماوە . سۆمایی چاویشی ڕۆرژاوە هێندەی وردکە کاغەزان بخوێنێتەوە.....

ئیدی نەمدەزانی چ بکەم دەردی خۆم کەم بوو، دڵسۆزی دایکیشم سەعات بە سەعات دەردی لەسەر گران دەکردم.ئەو پێی وابوو ئێستا دووساواکی دەسرەیەک بە دەستەوە دەگرن و وێڕای دایکمدەگرین. ئاخر زۆرجار بە پاڕانەوە منی پەڕاندبۆوە .لە مەدرەسە لەسەر مەشق نەنووسینەوە زۆریان وەدەردەنام بەلام دەهات و دەستی دەکرد بە گریان جارجارەش رووی لەمن دەکردو لێم تووڕە دەبوو .شەڕە گورگانەیەکی لەگەڵ دەکردم و هەر لە خۆڕا دەیگوت:

ـ باشە ئیدی! ئەگەر حەیات بێ بەستە .ئەوە ئاغای مدیر ئەو جاریش لێت خۆشبوو.

ئیدی ئاغای مدیر کە دەیزانی تازە چارە نیە و دایکم هەم لەباتی من و هەم لەباتی ئاغای مدیر قسە دەکا بزەیەکی دەهاتێ و لێمخۆش دەبوو.

بەڵام ئەوجار لەگەڵ ئەو دەم جیاوازی بوو .هەرکە زاری هەڵدەبڕی و قسەی دەکرد تاوانی قورستر دەکردم و ئەوانی لە گرتنم سوورتر دەکرد.

تازە زانیم کە چەڵەیەکی گەورەم کردووە .دەبوولەپێشدا من لەگەڵ دایکم قسە بکەم. زەینی ئامادە بکەم تا بزانێ من چ دەکەم؟ یا هیچ نەبێ لەماڵی خۆمان لەلای کۆبوونەوەم نەبێ بەڵام تازە کار لەکارترازابوو ودەرفەتی ڕێنوێنی سیاسی نەمابوو.

مۆرەیەکم کرد بەڵام دایکم وەک نە بای هاتبێ و نە بۆران لەوانە نەبوو دەست لە ئاغای ساواک هەڵبگرێ.

ـ کوڕم بابەکەم ئەوەتا ئاغای دەوڵەت خودا دەست بە عومری بگرێ دەڵێ کوڕەکەت کوڕی چاکە ئەتۆش ئیدی بە قسەیان بکە ڕۆڵە ئاغا لە خۆمانن خراپەی تۆیان ناوێ.

ـ بەڵێ بەڵێ لە خۆتانین! دەی باسی وردکە کاغەزت دەکرد.

ـ ئا...ئا... براڵە پیری و هەزار عەیب .وەخت بوو لەبیرم بچێتەوە ،ئەو هەموو وردکە کاغەزەی بۆ دێنن.هەر چەند جارێ دەیانخوێنێتەوە چەپ و چیر دەبێ،دەست دەکا بە جنێودان و لەخۆدان و چاو پێشی دەبێتە دمی مردوو بەڵام نایخواتەوە و هەتا دەشەوان وادەغەزرێ کەس ناوێرێ بیدوێنێ.کوڕە بەقوربانت بم ئاغای ڕەئیس ددانم لە زاری کەوت بەڵام شەیتان چووە دە کەلێژەیەوە .بۆخۆت نسحەتی بکە.

ـ بەڵێ وای نسحەت دەکەین بەکەیفی تۆ ڕاوەستە.

ـ ئای بەقوربانت بم. دابێنە لاقت ماچ بکەم.

ئەوجار بەخۆم نەبوو گوڕاندم.ئەو دایکەی لەماوەی ژیانمدا لە گوڵ کاڵترم پێ نەگوتبوو،لێ بڕام بەسەریدا بگوڕێنم .ئاخر وەکی وەسەری کردبوو مەترسی سەروماڵم بوو

ـ دایە بەسە! بەدبەختت کردم .دەزارت وێک نێ.

دایکم وەک تازە شتێکی لێ حاڵی بووبێ دەستی کرد بە گریان.پاش ئەوە کتێبە ـ کانیان هەڵگرت منیان دیسان وەپێشە خۆ داوە. داد و بێدادی دایکم بێ سەمەربوو تازە لێی حاڵی ببوو چ بە چیە؟

من لەتلەتیان کردبام خوێنم لێ نەدەهات. ئاورم داوە تا بۆ دوامین جار دایکم ببینم ،بەم حاڵەوە زگم پێی دەسووتا ،بریا هەر ئاورم نەداباوە .چون هەرکە چاوی پێم کەوتەوە گوتی:

ـ ڕۆڵە بابەکەی بابم بۆ کوێت دەبەن؟ دەستی کردەوە بە گریان.

ـ یارەبی هەتیوی قالەسەر زلی قەت نانی بەدوێ خۆت نەخۆی.تیری نەبەدیت بۆ نازڵ بێ.ئاخر ڕۆڵە خودا غەزەبی لێ گرتبووی؟ نەمگوت لەگەڵ هەتیوی قالەسەرزل و جوانە مەرگە چاوزیتەکەی برایمە سووری مەگەڕێ! دە ئەوەتا هەڵی بگرەوە دەی!.

کابرای ساواکی لەسەرەخۆ ئەم دوو ناوەی لە کاغەزێک نووسی و منیان وەپێش خۆ دا.

نامەوێ باسی ئەوە بکەمکە چم بەسەرهات و لە کوێیان کردم تەنیا ئەوە دەتوانم بڵێم کەپاش حەوتوویەک شوانە و ڕەزاشیان گرت .هەر سێک دۆست کەوتینە جێگایەک. دەمزانی چون منیان پێش ئەوان گرتووە پێیان وایە من ناوم بردوون.هەر بۆیە پاش بەخێرهاتنیان گوتم:

ـ دایکم....

بەڵام نەیانهێشت چیدی بڵێم .تفێکیان لێکردم و بێدەنگ بوون،زانیم ئەگەر قەراغی لێ بکێشم لەوانەیە لێشم بدەن.

قەراریان بۆ هەر سێکمان بڕێوە و هەر یەکەی بۆ لایەکیان هەڵداشتین ۴ ساڵ و ۶ ساڵ و ۷ ساڵ زیندانیمان کێشا و ئازاد بووین.

ئێستا کە لە خیابان و کۆڵانان تێک هەڵدەنگووین خۆ دەبوێرن هەردووک لێم لالووتن و کێردم لێ دەسوون.

ئەوان ئێستاش پێیان وایە من ناوم بردوون و پێوەم کردوون بەڵام ئەوەی ڕاست بێ هەر ئەمە بوو.

جا ئەوە پاش چەند ساڵ سەر لە نوێ دەبێ بچم و بۆیان ڕوون بکەمەوە کە من ناوم هەڵنەداون بەڵکوو دایکم سیاسەت نازانێ. جا نازانم بڕوام پێدەکەن یا نا؟

# جوغرافیای شارستانی سەقز

شایـــی :

شایی بەگشتی لە هەمـــوو شوێنێکی کوردستان داب و دەستوورێکی دوور و درێـــژی هەیە . بەڵام داب و دەستووری هەر شوێنەی لەگەڵ ئی شوێنێکی تر جیاوازی هەیە ، لە سەقـز پێش مارەکردن خوازبێنـی و دیاری کردن باوە ،ماڵی زاوا دەبێ پێشەکی پووڵێکی زۆر بەناوی شیربایی بدەن بە ماڵە بووک ، بووکیش دەبێ رۆژی گواستنەوەی جیاز دەگەڵ خۆی بەرێتە ماڵـــە زاوا ، دوای تەشریفاتێکی سەرەتایی شایی دەست پێ دەکرێ،شەوێک پێش گواستنەوە لە ماڵـــی زاوا دابی شەوگەڕ ، لەماڵی بووکیش دابی خەنەبەندان ئەنجـــام دەدرێ و شەو تا بەیان‌ناخەون و بەکەیف و نەهەنگ و ساز و ئاوازەوە رایدەبوێرن.هەر ئەو شەوە ماڵی بووک لە کچی دەر و جیران و خزم و ئاشنایـــان دەگێڕنەوە و بـــە شـــادی و سرووروەوە خەنەبەندان دەکرێ بۆ سبەی ئەو شەوە هەردووک لا ( ماڵی بووک و ماڵـــی زاوا ) شایی دەگێڕن، شایەری کورد هەوای چۆپی لێ دەدەن و گۆرانـی دەڵێن،میوانان بـــە تایبەتی ژنان هەرکە گوێیان لە ئاهەنگ و گۆرانی بوو ،لە حەوشەی ماڵەکەدا دەس دەگرن و دەیکەن بە هەڵپەڕکێ،پـــاش نانی نیوەڕۆ سەرلەنوێ دەس دەکەنەوە بە هەڵپەڕین و بەزم و ئاهەنگ ،لای سەعات سێ یا چواری پاشی نیوەڕۆ ،خـزم و کەس و میوانەکانی مـــاڵـــی زاوا بۆ هێنانی بووک بـــە ساز و ئاواز و چەپڵەرێزانەوە وەرێ دەکەون، لە لایەکی‌تـــر ـ یشەوە بووک کە بە شێوەیەکی تایبەتی رازاوەتەوە و قوماشێکی تەنک و شاشی سوور (تارا )ی بە سەردادراوە ،ئامادەی رۆیشتنە دوو برا یا دوو خزمی نزیکـــی بووک باسکی دەگرن و تا بـــەر دەرگای حەوشەی دێنن،ژنێکیـــش ئاوێنە گەورە بەپێش بووکەوە رادەگرێ،بووک زۆر بـــــــە ئەسپایی دەڕوا و ژن و کچان دەورەیان داوە و بە گۆرانـــی گوتن و تەپڵ کوتانی شایـــەـ رانەوە بەرەوماڵی زاوا دەچن زاوا دەبێ تانیوەی رێ بەپیر بووکەوە بچێ و عەتری لەســـەر و رووی بپرژێنێ،ئەگەر ئـــەم کارە نەکا کەس و کاری بـــووک ناڕازی دەبن و لە جێـــــی خۆیان رادەوەستن و ئەوەنـــدە پێ دادەگرن تا زاوا بە ناچار مل بدا و بچێتە پێشواز ،پـــاش ئەوەی بووک گەیشتە مالـــــی زاوا دایک وکەس و کاری زاوا زێروەشێنی دەکەن یانی هەرکـــە بووک هاتە نێو حەوشەهێندێک نوقڵ و وردە پـــــووڵ و ئەسکیناسی بەسەردا هەڵداوێن پاشان بووکەکە دەبـــەنـــە ژورێکی دیاری کراو ،لـــــەم کاتەدا برێک هەڵواکە لـــە پێشدا کراوەبە حەوت بەش و هەر بەشەی دە لەتە نانێـــک نراوە ،لەبەر پێی دادەنێـــن . ئەمەش بڵێین کە دوو ژنـــی نیزیک و دەس‌نیشان کراو ئەو

کارەیان بەستۆیە، هەرکە یەکیان بەشێکی هەڵواکەی دانایەزەوی و بووک بەسەریدا رەدبوو ،ئەوی دی هەڵیدەگرـ ێتەوە بەم جۆرە بەسەر هەر حەوت بەشە هەڵواکەدا دەڕوا و ژنان بە تایبەتی کچەکان گورجێکی هەڵواکە دەقۆزنەوەو لەنێو خۆیانیدا بەش دەکەن و دەیخۆن، بەڕای ئەوان خواردنی ئەم هەڵوایە تەبەڕوکێکی تایبەتی هەیە و مەقسوودیان حاسڵ دەکا ،لەم کاتەدا لە ژووری بووک،دەبێ بە قریوەقریو و هەرا و هوریایەکی سەیر ،زاوا دەبێ بچێتە کن بووک و وەختێک هەر دووک بەرەورووی یەکتر راوەستان،زاوا دەستی بووک کە لەپێشدا بە دەسرەیەکی تایبەتی لە پێشەوە لێک بەستراون و دەستی راستیشی نەختێکی نەبات تێدایە ، دەکاتەوە، لەو دەمەدا هەر دوولا حەول دەدەن پێی خۆیان بخەنە سەرپێی ئەویتر دەڵێن هەرکامیان سەرکەوت دەبێتە هۆی زاڵ بوونی یەکجاری بەسەر ئەویدیدا. دوای بەجێهێنانی ئەم دابە بووک و زاوا بەتەنیشت یەکترەوە دادەنیشن و یەکێک لە ژنەکانی ماڵی بووک،کەللە قەندێک بە دەستەوە دەگرێ و چەند سانتیمیترێک لەسەری بووک و زاوا بەرزتر،رایدەگرێ و دەیشکێنێ و هێندێکی بەسەر ژناندا دابەش دەکا ، دەردەکەوێ و مەراسیمەکە پاشان زاوا لە ژووری بووک تەواو دەبێ .

| ڕێگاکان | کیلۆمیتر | شۆسە | ئیسفالت |
|---|---|---|---|
| ڕێگەی سەقز و مەریوان | ١٦٠ کیلۆمیتر | = | = |
| = = بۆکان | ٣٦ = = | = | = |
| = = بانە | ٦٤ = = | | |
| = = دیواندەرە | ١٠٠ = | | = |

| ڕێگەی گوندەکان | کیلۆمیتر | شۆسە | ئیسفالت |
|---|---|---|---|
| سەقز و ئێران خوا | ٥٤ کیلۆمیتر | | = |
| = سونەتە | ٣٣ = | = | = |
| = ساحێب | ١٧ = | | = |
| = ئایەنان | ١٥ = | | = |
| = سەرا | ١٨ = | | = |
| = میرەدێ | ٣٢ = | = | = |
| = دووڕێ یانیتیکاب | ٥٦ = | | = |
| = دووڕێیانی تیکاب بۆ تیکاب | ٦٤ = | = | = |

کارخانە و کارگا : ١ـ دوخانیات ٢ـ کارخانەی ئارد

# رەخنە

«مەنسوور حامیدی»

ئەگەر رەخنە گرتن لە مەبەستێکی ئەدەبی پێویستی بە زانستێکی بنەڕەتی سەبارەت بە دەستوور و قانوونی چیرۆک نووسین و پەخشان و شانۆ و شیعرهەیە کە دە خۆمیدا شک نابەم ،بەڵام هەرچی کردم و کراندم خۆم پێ ڕانەگیرا و ناچار بووم ئەو چەند رەخنەیە بنووسم ،تا بەڵکوو لەو بوارەدا مامۆستایانی زانا وبێدەنگ وەخۆ بێنەوە و بەنەقد و رەخنە گرتن لە چیرۆک و بابەتی تر بۆ رێنوێنی نووسەر و شاعیرە لاوەکانمان هەنگاو هەڵێنن تاکوو لە داهاتوودا بەرهەم و دیاری باشتر بەدی بێنن،با زۆر لە مەبەستەکە دوور نەکەوین.

ئەوەی لە خوارەوە وەبەر چاوتان دەکەوێ چەند رەخنە ـ یەکی کورتە لەسەر سێ چیرۆکی سروەی ژمارە پێنج بەناونیشانی (بیرەوەری ) (خەجیلێ)و (مامحەسەن) کە ئەگەر بەکەڵک بوو پێشکێشتان ، ئەگینا ماڵی قەڵب سەروەساحێبی .

یەکەم بابەت کە زۆر بە کورتی وەبەر چاوی دەخەین چیرۆکی "بیرەوەری"یە کە دووسێ جارم خوێندەوە پێویستە لەپێشدا رابگەیەنم کە هەر نووسراوەیەک دەبێ مەبەستێک رابگەیەنێ،بە تایبەتی چیرۆک ،چوون نووسینی بیرەوەری بەشێکە لە چیرۆک نووسی، پێویستە پەیامێک کە بتوانێ شوێن بخاتە سەر بیروڕای خوێنەر بەیان بکا ،واتا ئاڵ وگۆڕێک لە بیروهەست و رەوشتی مرۆڤ دا بەدی بێنێ،بەڵام زۆر بەداخەوە نووسەری ئەو بیرەوەرییە ئەگەر لە هەڵەکانیتری چاوپۆشی بکەین هیچ قسەیەکی نەبوو کەبیڵێ .

من زۆر کەسم پێ شک دێ کە بیرەوەری بەس جوانتر و خۆشتریان لەلا هەیە ،ئەگەرچی نەشتوانن کراسێکی جوانیان لەبەر بکەن و بە وشە و رستەی جوان بیان رازێننەوە بەڵام هیچ نەبێ دەتوانن ماوەیەک خوێنەر سەرگەرم بکەن، با لە رێگامان لانەدەین،ئەگەر "بیرەوەری" بەرهەمی هەوەڵی نووسەرە دیسان جێی دەمێنێتەوە بەومەرجەی کە نووسەر پتر کار بکاو باشتر و وردتر سرنج بدا .

نموونەی هەڵەکانی نووسەر ئەوەیە :

لە پێشەکی نووسراوەکەیدا بەهار و دیمەنی سروشت و چیای بەرز و بەتایبەتی دیمەنی سەیرانگەی" کانی شێخان" لە کاتی بەهاردا تاریف دەکا و لە ناکاو دەبینین کە خۆی بەیانی یەکی هاوین دەچێتە "کانی شێخان " ئەویش بە داشقەی ئەسپ، من کە لە منداڵییەوە زۆرجار بەهار و هاوین تەنانەت پاییزیش چوومە ئەو شوێنە تاکوو ئێستا نەمدیوە داشقەیەک گەیشتبێتە ئەو جێیە ، تازە لەوێش دەست هەڵگرین من بۆم روون نەبووە نووسەر کام مانگی هاوین چۆتە ئەو شوێنە کە کێوەکانی دەوروبەری پەڵە پەڵەی بەفری لێ ماوە و داوێنیان بە بەرگی سەوز وەک بووک رازاوەتەوە ،پێم وایە لە بەهاردا چۆتە ئەوێ و خۆی ئاگای لێ نەبووە ، ئێوە باوەڕ ناکەن وەرن بزانن خۆی چۆن دەنووسێ :(ئایا هەموو کەس وەک من بە هاتنی بەهار شەیدا دەبن ؟ هەموو بەهاران جارێک یان دووجار دەچم بۆ کانیشێخان و بەچاوی ئەو سەردەمەی منداڵییەوە دەڕوانمە سەر دیمەنی جوانی کە وەک.....)

ئێستا ئێوەش باوەڕتان کرد کە نووسەر بە بەهار چۆتە کانی شێخان بەڵام لەبیری چۆتەوە.من لێرەدا بەو بڕایە پێشنیار دەکەم بەر لە نووسین خۆی ماندوو بکا و شتێک بدۆزێتەوە کە شیاوی باسکردن بێت چونکوو بە ڕاستی "بیرەوەری" هیچ شوێنێکی نەختە سەرمن تا ئێوە دەڵێن چی !

من ئاگادارم کە خەجیلێ بەرهەمی هەوەڵی نووسەرە،بەڵام دیسان وا باش بوو کە بەر لە چاپکردنی بۆ چارەسەرکردنی هێندێک لەو هەڵانەی لە نووسینەکەی دایە هەنگاوی هەڵێنابا ،لێرەدا بە پێویست دەزانم کە بڵێم چیرۆکنووسین لەگەڵ وێنەگرتن جیاوازە، وێنەگرتن بریتییە لە پێشاندانی شتێک یان ڕووداوێک یان دیمەنێک لە کاتێکی ، ڕاوەستاوی زەماندا بەڵام نووسەر هەر ئەو شتانە لە درێژایی و تێپەڕبوونی زەماندا پێشان دەدا .جوانتر بڵێم لە وێنەدا هیچ شتێک ناگۆڕدرێ،بەڵام لە چیرۆکدا تێپەڕبوونی زەمان ئاڵ وگۆڕ دەخاتە سەر ڕەوشتی مرۆڤ و تەبیعەت.جا بۆیە نووسەر دەبێ بڕوای بەوە بێ کە مەبەستێکی کە دەینووسێ نابێ تەنیا وێنەیەکی جوان و ڕاوەستاو لە سرۆشت و مرۆڤ یان جیهان بێ.هیچ پێویست بەوە نیە کە دیسان بڵێم نووسەر ئەرکێکی گەورەی وەئەستۆی خۆی گرتووە و ئەویش هاندانی مرۆڤە بەرەو پێشکەوتن و هەراش بوون.دەبێ دیاردەی ئەدەبی و هونەری مەبەستێکی نوێ بگەینی.چیرۆکی خەجیلێ لەو بابەتەوە تەنیا وێنەیەکە و هیچیتر .کاکڵی چیرۆکەکە ئەوە بوو کچێک بەنێوی خەجیلێ نەخۆش دەبێ و لەکاتی چوون بۆ سەردوکتۆر لە ڕێگادا دەمرێ.ئێوە بە من بڵێن پەیامی نووسەر چ بوو؟ با زۆر دوور نەڕۆین چیرۆکی خەجیلێ لەباری ئەدەبیش چەند هەڵەی تێدا بوو ،بۆوێنە لە سەرەتادا دەڵێ(کۆتری شەو لە شەقەی شاباڵی دابوو) من تائێستا پێموابوو کۆتر نیشانەی هێمنی و ئاشتییە . بەڵام چابوو زانیم کۆتر دەتوانێ نیشانەی شەڕ و مەترسی و تاریکی و شتی بەسامی وەک مۆتەش بێ ! لەحاڵێکدا کە شەو بە کۆتر شپاوە ،چەند دێڕ خوارتر دەنووسێ:"دەنگی مەلێک لەنێو پۆلەچنارەکەی خوارووی ئاوایی پەردەی شەوی دەبزاوت" کە بەس ڕوون و ئاشکرایە شپاندنی یک شت لەکاتێکدا بە دووشتی جیاواز لەباری ئەدەبیەوە دروست نیە

ئێستاش بۆم دەرنەکەوت کە نووسەر هۆی کەمتەرخەمی مام هەمزەی لە بردنی خەجیلێ بۆسەر دوکتۆر بۆ نەنووسیوە؟ خەجیلێ بەستەزمان سێ ڕۆژ بە جێ وبان دەکەوێ ومامهەمزە و خات بەسێی دڵ ڕەق هەتا ڕۆژی سێهەم کە حاڵی زۆر تێکدەچێ، وەخۆ نایەنەوە(شەوێ دیش هەر بەمجۆرە تا بەیانی لەسەر خەجیلێ دانیشتبووین بەڵام ئەمشۆ زۆر نارەحەت ترە) من لێرەدا دەڵێم کە تەواوی ئەو کارانەی کە لە دواییدا مام هەمزە بۆ ڕزگاربوونی خەجیلێ لە چەنگ نەخۆشی دەیکا بێسوود و بێکەلکن . واتا هەر نەخۆشێکی دیکەش ئەگەر سێ ڕۆژان بەحاڵی خۆی بمێنێتەوە و لە ئاکامدا بە شێنەیی بیبەنە دوکتۆر عومری خۆش بۆ ئێوە بەجێ دێڵێ! قوڕبەسەر خەجیلێ بۆ دایک و بابێکی کە هەیەتی، جا با مام هەمزەش دەستی دڵۆی دەر ـ کردبێ یان پشتی چەمابێتەوە و یان هەژار و بێپارە بێ.

دیمەنی مام هەمزە و خات بەسێ زۆر ناحەزە. بەتایبەتی خات بەسێ کە دەبینێ خەحیلێ لە ڕێگادا مردووە بەڵام نازانێ کێ بە کێیە .ئێستا بۆی ڕوون نەبۆتەوە بۆچی وەڕێکەوتوون و دەڵێ( جادوکتۆر چی پێ دەکرێ ئەوە مقەدەری خودایەو مام هەمزە کە چەندکراسێکی زۆرتر خەسار کردووە دەڵێ : (ڕاستە ئافرەت بەڵام کول و سەبەبیش هەیە ) من دەپرسم بریا مامهەمزە سەبەبەکەی

دەست نیشان دەکرد و لە ئاکامدا چاویان لێکدەبڕن و سەرلەنوێ لە قوڵپەی گریان دەدەن ئەڵبەت ئەمجار بۆ من و تۆ دەگرین کە دەبێ ئەو چیرۆکە بخوێنینەوە و پەندی لێ وەربگرین!

ئێمە ئەگەر ئەوکەم و کووڕیانە نەبینین دەتوانین داهاتوویەکی روون و باش بۆ نووسەرەکەی پێش بینی بکەین چونکوو سەرەرای ئەو مەبەستانەی باسمان کرد نیشانەی ئینسان دۆستی و مرۆڤایەتی، بەر لە هەر مەبەستێکیتر وەبەرچاو دەکەوت کە خۆی دەتوانێ ئامانجی نووسین بێ.وێرای ئەوەش ئەگەر هیندێک لەو قاعیدە و دەستوورانەی چیرۆک نووسین دەکار بێنێ و لە چیرۆک و چیرۆک نووسانی جیهان و بەرهەمباشەکانیان زۆرتر وردبێتەوە و لاسایان بکاتەوە دەتوانێ هۆی پشت ـ ئەستووری ئێمە لە داهاتوودا بێ. خودا بیپارێزێ.

چیرۆکی مامحەسەن ئەگەر بۆ نووسەرەکەی تاقیکردنەوەیەکی نوێیە بۆ فێربوونی چیرۆک نووسین بۆ منی تامەزرۆ خوێندنەوەی چیرۆکی پتەو و رەسەن ئەوەی هێشتەوە کە بڕوا بکەم لە داهاتوودا چیرۆک نووسین لەنێو ئێمەشدا لە ئامانجی بنەڕەتی خۆی کە بریتیە لە پێشاندانی زام و ئێش و ئۆفی مرۆڤ بەزمانێکی پاراو و رەسەن نیزیک دەبێتەوە .من ئەو مەبەستەم لەدوای خوێندنەوەی مامحەسەن هەست کرد بەڵام لەو برایە تکا دەکەم کە سەرنجێکی زۆرتر بداتە سەر رێزمان و هەر رستەیەک کە دەینووسێ لە ماناکەشی وردبێتەوە .دیسان پێشنیار دەکەم کە قارەمانەکانی چیرۆکەکەی باشتر بناسێ و خووخدە و ئاکاریان زۆر نەگۆڕێ.ئەگەر ویستی رەوشتی یەکێک لە قارەمانەکانی بگۆڕێ دەبێ رووداوێک کە بۆ خوێنەر روون و ئاشکرایە ئەو ئاڵ و گۆڕە بەدی بێنێ.بەکورتی بڵێم چیرۆکی مامحەسەن چەند هەڵەی تێدابووکە دەبێ نووسەر لە داهاتوودا لەو چەشنە هەڵانە خۆ بپارێزێ. بۆ وێنە نووسەر لە جێیەکدا دەنووسێ (لەژوور سەری دادەنیشێ و کەمێکی دەشێلێ) کەمن هەرچەند بیرم کردەوە کەسێکم پێشک نەهات کە بتوانێ لەژوور سەری کەسێک دانیشێ و لەوێرا نەخۆشێکی راکشاو بشێلێ (ئێوە ئەگەر دیوتانە خەنی لە خۆتان) یان لە شوێنێکیتر سۆفی پیرۆت بۆ حەسەن دەگێڕێتەوە کە (رۆژێکی قاوەڵتوونێ چوومە لای.ئەتۆ لە ماڵ نەبووی...). من لە ئاکامدا بۆم دەرنەکەوت ئایا سۆفی پیرۆت لەبن دەرگا خۆی گرتبوو یان لەلا دایک وبابی دانیشتبوو کە بەش بەحاڵی خۆم بڕوا ناکەم دایک وبابی حەسەن لەلای سۆفی پیرۆت بەو شێوە وت و وێژ بکەن و باشتر ئەوە بوو کە نووسەر ئەو شوێنەی کە سۆفی پیرۆت قسەکانی وا بەجوانی گوێ لێ بووە دیاری کردبا.هەر وەها لە هەموان لەبەرچاوتر ئەوەیە کە نووسەر ژیانی تاڵ ونالەبار و پڕ لە مەینەتی مامحەسەن دەخاتە ژێر زەرەبین و دەنووسێ: (رۆژگار وەک ئەسپێکی سەرکێش لغاویان لێ داوێتە سەر کەڵپان و ئیختیاریان لە دەست دەستێنێ و هەردەم بە لایەکیاندا دەدا .خێر و سەدەقەسەری خەڵکی نەبوایە زۆر لەمێژ بوو لە برسان دەمردن) بەڵام هەر ئەو مام حەسەنە هەژار و لێقەوماوە بەدوای مردنی خێزانی لەپڕ دەوڵەمەند دەبێ و شوانەی وەبیر دێتەوە و دەڵێ : (دەیهێنمە لای خۆم و لەبەر خوێندنی دەنێم و من دەڵێم ئەڵبەت بەخێروسەدەقە سەری خەڵکی!).

نووسەر دەبێ ئەو مەبەستانە زۆرتر وەبەر چاو بخات تا لە نووسراوەکەیدا هیچ چەشنە جیاوازییەک لەباری مانا پێک نەیە .خودا ئاگای لە هەمووتان بێ.

# کایەی کوردی

## چەختی

کایەی کۆمەڵی کوردی
ئەوانەنە بە وردی
زستانان بگرە مزرەق
لەسەر سەهۆڵ وجێی رەق
لەسەربانان شێلاقێن
لە هۆڵ مەنجەڵ باباقێن
یا دانوو دەرچەی دەکەن
یا بانگی شەمچەی دەکەن
دەنا مێشێن و جگێن....
لە نەوروزێ هێلکە شکێن
بە چێشتانان هەلووکێن
دەنا هەددار و گۆێێن
جارجارە خوززە و تۆپێن
لای ئێواران فودباڵێن
لەنێو دێی خۆشارۆکێن
جەغز و ئەلیاس،بن پووشکێن
هینگڵە شەلە و خەستەکێن
لەبن کورسی باوباوێن
یا نەقلی بزنەو مەڕەی
دەنا تەرکی بن بەڕەی
لەبەر بەرخان بازەڵێن
ئەی سێ و قیزە پشتەکێن
بەشەو کەڵەکە بڕین
جارجار هەیجۆ هەیجۆێێن
هێندێک کۆسەی دەگێڕن
بەعزێک قەڵسەی دەگێڕن
یا قۆچەقانی لوێ بێ
جا دەستی دەهەر کوێ بێ
بۆ جحێلان جۆرابێن
بۆپیردامە و نۆڕسکێن
قۆرغ و شاو وەزیرێن
لە گەلێک ماڵان دەکرێن
بۆ باریتێ کێل بەردێن
ئەگەر باری خلیسکێن
مووسا و فیرعەونیش هەیە
شۆخێکی بێ بەهرەیە

خۆشە گورجی بەفیتوان
ئەگەر لێی حاڵی بێ جوان
حیندرحۆ و پوورە گوڵێ
بارەمێوژ و بارە خوێ
گورجە کوێرە و غارەکەر

هەرکەس نەیبی زەلیلە
هەرکەس خۆی بۆ خۆی
نێوت چییە و چ دەخۆی
گەرە لاوێژە و مینجێن
گارگارە کڵاو سوورێن

لەجێی نەرم و بێخەتەر
مانگا بەکەڵ و مووروێن
حەجج و ئیعدام ئیعدامێن
گەزی جۆلای سێ کوچکە
بە تۆپی جیر نەک کوچکە
بلێند کردنی نستوو
بە چوار قامک و بەفیتوو
راوە جووشک و دەڵەتوو
تا وەکوو یەک بین هەموو
تەڵە رێوی و کۆنەئاش
پیس دەبێتە هاشەهاش
سینگەسەیە و ساپساپێن
گەنم گەنمێن،دایەڵێن
هەڵوای شەپان،ئاشەوان
تاقمانە جووت، گوێلکەوان
دایە مەمدە بە گورگی
شەڕی مەڕ دەگەل گورگی
سێگجە و گوێ پروسکێن
شێر و خەت و میرمیرێن
تەقیلە لەسەر تەقیلە

نوختەبازی بە دەفتەر
یا پاڵەوانی سێسەر
خوو گەملە و زۆرەوانی
عووروسی یا کوردانی
بووکەبارانە و مەلە
لە جۆمالێ هەمزەڵە
گاگۆزەڵ پەندەر پەنیر
لێ دروونی بەڕەو حەسیر
زنجیر منت گەرێ دا
بۆ پشت کێوت فڕێ دا
سێباز و گورجی بن لاق
تۆپی جەغزی و تۆتفەراق
هەی دادی بە چەپۆکان
شەڕە کەڵ لەسەر چۆکان
لێدە و کەپری بە کەشکان
جۆلانە لەجێی مەشکان
مامە سوورە و شالیاوە
دەرزی بە قۆیتاس ماوە
جۆرابێنی بە کەوشان
لە مەجلیسی دڵخۆشان

# هونەر و هونەرمەندانی کوردستان

سەرەتای مانگی خاکەلێوە لەگەڵ هاوڕێیەکم بۆچاوپێکەوتنی هونەرمەندێک بەرەو گوندی "بەرکەمران"ی پێوانشار وەڕێ کەوتین هەتا "کەندەقوولان" بە ماشێن وئەنجا بە پێیان لابڕ لێماندا. سەرەڕای ئەوەی هەوەڵی بەهار بوو، چیا بەرزوگەردن کەشەکان خەملا بوون وهەتا چاو هەتەری دەکرد هەرشین دەچوون. لەپەڵە هەورێکی بەهاری وردەبارانێکی بەڕەحمەت نمنم دەباری، کوڵکە زێڕینە لە دوورەوە وەک پەڕی تاوسێکی بەناز خۆی بەحەوت ڕەنگان دەنواند. بەرامەی گیاوگوڵ وبۆنی گڵی تەڕ تێکەڵ بوون و بیروهۆشی لەسەری هەموو ڕێبوارێک دەڕفاند. ئێمەی گیرۆدەی دووکەڵ وقیلەتاو نەماندە–زانی بڕوانینە کێهە لا! هەوڵمان دەدا زۆر وشیارانە هەنگاو هەڵێنینەوە نەوەک پێ لەگوڵە گەزیزان بنێین وجوانی خۆڕسک پێ شێل بکەین. ڕووم لە هاورێیەکەم کردوگوتم:

– لەخۆڕا نەیانگوتووە "کوردستان بەهەشتی سەر زەمینە ".

لەوڵامدا گوتی: "ئەو بولبولە خۆش ئاوازە کە ئێمەی هەڵوەدا کردووە، لە داوێنی خۆڕسکی ئەوتۆدا پێ گەیشتووە و چریکەی لەخرِودۆڵی ئاوادا دەنگی داوەتەوە" ئەو خۆڕسکە ڕازاوە ئاگای ڕێ بڕینی لێ بڕین وهەر ئەوەندە خۆمان لەبەر کانی یەکەی نێودێ "بەرکەمران"دیتەوە. کوڕێکی مێرمندال وەپێشمان کەوت وماڵەکەی پیشان داین.

دوای سڵاوو چاک وخۆشی وحەسانەوە یەک هاتینە

سەرباس وگوتم :

– لە دوورەوە هاتووینە خزمەتت،ئارەزووی دیدارتمان هەبوو.

– پێلاوتان لەسەر چاوم ،مەمنوونم کە بەسەرتان کردوومەوە.

تێمگەیاند کە هاتووین بەسەرهاتی بنووسینەوە زۆر بە رووخۆشی دەستی پێ کرد :

– ناوم "حەمەیە ،شۆرەتم "ئارمان"ە .بە حەمەدی ئاغای" مەنشوورم .ئێمە جافین لە مێژساڵە پەراگەندەی ئەو مەملەکەتەی بووینە بابم لە "سونجاغ"ی محاڵی ئاختاچی مەهاباد-دا،گیرساوەتەوە . لەوێ را ماڵمان هاتۆتە "زگ دڕاو"ێ ."عورووس"وگرانی کە بەسەرداهات چووینە "سارەوانان"و"حەوتەوانان ۴۰ ساڵ دەبێ کە پەڕیوەی سندووس ولاجانێ بوومە وهێندێک لە نەغەدە وخانێ ژیاوم . ئەوە ماوەی چەند ساڵە لەبەر کەمران" گیرساومەتەوە ولەماڵە خەڵکدام ۱۰۳۰ ساڵم تەمەنە ،ساڵی گرانی(۳۶- ۱۳۳۵ هجری قمری ) پیاوبووم .ساڵی ئەرکانی لەشەڕی عورووساندا بەشداریم کردووە ،عورووس وتورکەمان لە ئێراندا شەڕیان سازکرد مەلایان جەهادیان-دا .عاشیرەتی کورد کەوتنە گەڵ تورکان وبە دژی عورووسەکان شەڕیان کرد. لە شەڕی سۆفیانێ کە کەریم ئاغای دایماوێ گوژرا دەگەڵ بووم .

– چۆن بوو کە مەیلت بۆلای بەیتان راکشا -دەنگ وسەدایەکی خۆشم هەبوو ،بە جحێڵی داوەتم دەگێڕا .بەڵام دوایە مەیلم پتر چووە سەربەیتان .کابرایەک بوو" کەریم خاڵ خاس"یان پێ دەگوت ،کەسی وانەبوو،لە هیچ دانەدەما ،زۆر بەیت بێژێکی چاک بوو . جاری واهەبوو ۲۰ شەوی لەگەڵ خەریک دەبووم هەتا بەیتێکی فێردەکردم. کاکە میووکاکە شێخ ،خەج وسیامەند ،سوارۆ ،لەشکری ،گەلۆ سەیدەوان ،کانەبی خوازێ پایزە .......... هەمووی لەوێ فێر بووم . -

– لە بەیت بێژانی قەدیم کەست لەبیرماوە؟

– زۆرکەس بەیتیان دەکوت،ئەودەمی قەدریان زۆربوو .پایزان کە خەڵک لەخۆدە-بوونەوە دێ بە دێ لەدوایان دەناردن .

مەجلیسێکی بەیتی تێدانەگوترابا سارد و سڕبوو"حەمەشێت"ی قەرەداغی بەناوبانگ بوو. خودا دابوویە هەرچی گوتبای بۆی دەهات ! گوتن هەر ئەو دەیگوت! "حەمەچەکاڵە"ی ، ترشەکانیش بەیت بێژی چاک بوو ،ساڵی گرانی بە پیری لە"سونجاغ" دیومە .نێوی "ئەحمەد حەڵوا"شم بیستووە دەڵێن بەیتی "کەڵ و شێوی داناوە " .

– چ ئارەزوویەکت هەیە ؟

– پیری دەرمانی نیە وپیر مەشموولی مردنێ یە ،ئارەزووم ئەوەیە ئیمان و قالبێکی ساغم بە نسیب بێ .هەروەها هیوادارم هونەردۆستان هەرچی زووتر قۆڵ هەڵماڵن و ئەو گەنجینانە (ئەوبەیتانە ) کە بەیت بێژان سینە بە سینە هیناویانن لە فەوتان نەجات بدەن ونەیەڵن لەگەڵ ئەوان بخرێنە ژێرگڵی ساردوسڕەوە وگەلەکەمان لە داهاتوودا لەو خەزینەیە بێ بەش بێ .

# بڕیارنامەی یەکەمین کۆنگرەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی

بەناوی خوای میری مەزن

سپاس بۆ دەرگای یەزدانی پاک کە ئەندامانی هەوەڵین کۆنگرەی گەورەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی یارمەتی دا تا وێڕای هەستی بەرپرسی وبە تێ بینی و زانستێکی تەواوەوە ڕەگەز پەرەستی وتەبعیزی نیژادی لە هەموو دونیادا مەحکووم بکەن و ئایەتی پیرۆزی "انا خلقناکم من ذکر وانثی وجعلناکم شعوبا " وقبائل لتعارفوا ان اکرمکم عندالله اتقیکم" ڕەچاو بکەن پاش باس وراوێژ لە ماوەی کۆنگرەدا بە تایبەتی وت و وێژی پێویست لە لایەن بەشدارانی کۆنگرەوە ودیاری کردنی ئەو بڕیارە پەسندکرا - وانەی کە جێ بەجێ کردنیان پێویستە ،ئەم مەبەستانەی ژێرەوە لە لایەن بەشدارانی کۆنگرەوە بەناوی بڕیارنامە رادەگەیەنین .

١- ئێمەی بەشداری یەکە - مین کۆنگرەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی بەر لە هەموو شت ئەو پەڕی رێزو سپاسی خۆمان سەبارەت بە بەرپرسانی بەڕێزی کۆماری ئیسلامی بە تایبەتی برای خۆشەویستمان جەنابی موهەندیس مووسەوی سەرۆک وەزیر کە پەیامی مێژوویی ودڵگری ئەو هەتوانێک بوو بۆ دڵی زامداری ئەم خەڵکە دەردەبڕین .

٢- هەروەک لە پەیامی سەرۆک وەزیری بەڕێزدا هاتووە ئەم کۆنگرە دان بەوەدا دێنی عیرفان هەروەک جاران لە شیعروئەدەبی کوردیدا وەبەر چاو بگیرێ.مامۆستایان و بنکەفەرهەنگی یەکانی فەرهەنگی وئەدەبی پێ سپێراوی شۆڕشگێڕانە وئیسلامی خۆیان بۆچارەسەری گیروگرفتەکان بەتایبەتی ئەوانی ناوچە بە سەرنجەوە بناسن وبۆلەنێو بردنیان هەوڵ بدەن .

٣- کۆنگرە هەست بە هەل ومەرجی حەساسی وڵات و گیروگرفتی زۆری شۆڕش بە تایبەتی شەڕێکی نەویستوو کە لە لایەن رژیمی دژی ئیسلامی وئینسانی بەعسی عێراق بەسەر گەلی ئێمەدا داسپاوە دەکا . لەم هەل ومەرجەی تا ئێستا دەوڵەتی مەکتەبی بۆ بووژانەوە وپەرەگرتنی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی پێکی هێناوە رێز دەگرین و چاوەڕوانی ئەوەین ئەگەر بلوێ بۆ پێک هێنانی هەل و مەرجی باشتر ئەمر بفەرموون .

٤- ئێمە باوەڕی پتەومان بەوە هەیە کە ژیانی پڕشکۆ و شەرەف بۆ هەموو لایەک لە ژێر سێبەری ئیسلام وکۆماری ئیسلامیدا دەگونجێ وبەراستی ئازادی تێکۆشانی فەرهەنگ و ئەدەبی هەموو نەتەوەیەک

(نەک شێوەی سیاسی ورفۆرمی ئەوکەلە هێندێک ولاتان باوە) وەختێک پێک دێ کەنێوەرۆکەکەی بیروڕای نیزامێک بێ کە لەگەڵ خووخدە وسروشتی بەشەری یەک دەگرێتەوە.

ئەسڵی پازدەی قانووسی کۆماری ئیسلامی ئێران کە ئازادی دەرس گوتنەوەی زمان وئەدەبی ناوچەی لە تەنیشت زمانی فارسی تەسریح کردووە لەرێبازی ئەم مەبەستە دایە هەر بۆیە کۆنگرە وێڕای ئەوە کە داوا دەکا ئەم ئەسڵە لەلایەن رێکخراووسازمانەکانی پەیوەندیدار بەم مەسەلەوە رەچاو بکرێ .کۆنگرە ئامادە بوونی خۆی بۆدانان ونووسینی هەرچەشنە کتێب وجوزوەیەکی ئامووزشی لەم بارەوە رادەگەیەنێ .

٥- کۆنگرە بۆ ژیاندنەوەی هەرچی پتری فەرهەنگ وئەدەبی کوردی بڕیار دەدا وێڕای ناساندنی هەموو خاوەن رایانی ئەم فەرهەنگە بناخە بۆ هەموو بابەتەکانی مێژوویی وجوغرافیایی و وشەناسی وبەیت وباو ....... دابڕێژێ ووێڕای رێکخستنی ئەم ئەنجومەنانە فەرهەنگستانی کوردی لە هەموو ناوچە کوردنشینەکان چاوەدێری بکا وچاوەڕوانی ئەوەیە کە ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی(ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی) بەرپرسی ئەم کارە وەستۆ بگرێ وسەبارەت بە جێ بەجێ کردنی حەولی پێویست بدا .

ئەندامانی کۆنگرە لە دەوڵەتی ئیسلام داوادەکەن تا سەبارەت بە پێک هێنانی هەل ومەرجەکان فەرمانی پێویست دەرببڕێ .

٦- وێڕای رێزگرتن لە یادی خوالێ خۆشبوو مامۆستا سەید موحەممەد ئەمینی شێخەل ئیسلامی (هێمن) و قەدر زانینی خزمەتی شایان وبەرچاوی ئەو بە فەرهەنگ وئەدەبی کوردی و سپاس لە نووسەران وبەڕێوە- بەران وکاربەدەستانی گۆواری بەنرخی "سروە" لە هەموو خاوەن رایانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی و هەموو خوشک وبرایانی کورد داوا دەکەین بە هەر شێوەیەک بۆیان دەلوێ نووسراوە وشیعر وسەنەد وبەڵگەی مێژوویی مان بۆبنێرن وبەرەخنە و پێشنیار سەبارەت بە بردنە سەری چەندەتی وچۆنەتی باری گۆوارەکە وپڕنێوەرۆکترکردنی یارمەتیمان بدەن ولە هیچ حەولێک بۆئەم مەبەستە خۆ نەبوێرن .

٧- هەروەک کۆنگرەدان بە پێویستی زمانێکی یەکگرتووی (عیلمی)کوردی دادێنێ بۆ وەدی هێنانی ئەم مەبەستە لە رێزمان ووشەی بەجێ لە هەموو زاراوەکان کەڵک وەربگرێ وبۆلێ کۆڵینەوە و تەحقیق لەسەر زاراوەکان وبەگشتی هەموو زمانی کوردی شوورایەک لە موحەقیق و پسپۆڕانی خاوەن‌را پێک بێ تا لە هەموو بارێکەوە مەبەستەکان شی بکەنەوە .بانگ کردن ولێ گێڕانەوەی خاوەن رایان وپێک هێنانی ئەم شوورایە بەستۆی ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی یە .

٨- چاپی کتێبی دەستنووسی کۆن ونوێ ،تەئلیف وتەسنیف شیعر و فۆلکلۆ و وتار ..... بەهەموو زاراوەکان وهەروەها کەڵک وەرگرتن لە لەهجەکانی جۆراوجۆر لەگۆوارە کوردی - یەکان گرینگە ولە پەنای زمانی یەکگرتوو پەرەگرتنی لەهجەکانی جۆراوجۆری تریش لەبەر چاوبێ .

٩- کۆنگرە رێنووسی ئێستای گۆواری سروە بەرەسمی دەزانێ ولەسەرچاپی کتێب و گۆوارەکانی کوردی بەم رێنووسە پێ دادەگرێ .

١٠- پێویستە پەیامی سەرۆک وەزیری بەڕێز و عینایەتی تایبەتی ئەوان سەبارەت بەم جووڵانەوە فەرهەنگی یەبەزامنی بەڕێوە بردنی ئەسڵەکانی پەسندکراوی ئەم کۆنگرە دابنێین.

مریشکه قوڵەیەک بوو ،مریشکه قوڵه .رۆژێک،
توێکڵه پیوازێکی بەشانیدادا و دوو توێکڵه
گوێزی دەلاقی کرد وەوەرێ کەوت .
گوتی : دەچمه شاری شووکردن.
زۆر رۆیی،کەم رۆیی، تووشی گاوانێ بوو.
گاوان کوتی :
مریشکه قوڵه بۆکوێ دەچی ؟
مریشکه قوڵه کوتی :
مریشکه قوڵه ودەردو سندان .
گاوان کوتی :
ئەدی بڵێم چی ؟
کوتی : بڵێ .
تەق تەقی کەوشان
پۆلی وەنەوشان
چارۆکه پیوازی
بە قەبز ونازی
بۆ کوێ دەچی؟
گاوان کوتی :
تەق تەقی کەوشان
پۆلی وەنەوشان
چارۆکه پیوازی
بە قەبز و نازی
بۆ کوێ دەچی؟
مریشکه قوڵه کوتی :
دەچمه شاری شوو کردن
گاوان کوتی :
شوو بە من ناکەی ؟

مریشکه قوڵه کوتی :
بە چم بەخێو دەکەی ؟
گاوان کوتی :
بە نانی گاوانی.
کوتی :
بە چم لێدەدەی ؟
کوتی :
بەو گۆپاڵەی .
مریشکه قوڵه کوتی :
نا! دەمرم شووت پێ ناکەم.
دیسان رۆیی . تووشی شوانێک بوو .
شوان کوتی :
مریشکه قوڵه بۆکوێ دەچی ؟
کوتی :
مریشکه قوڵه ودەردو سندان.
شوان کوتی :
ئەدی بڵێم چی ؟
کوتی بڵێ :
تەق تەقی کەوشان
پۆلی وەنەوشان
چارۆکه پیوازی
بە قەبز و نازی
بۆ کوێ دەچی؟
شوان کوتی :
تەق تەقی کەوشان
پۆلی وەنەوشان
چارۆکه پیوازی

بۆ کوێ دەچی؟
مریشکە قوڵە کوتی :

دەچمە شاری شووکردن .
شوانکوتی :
شوو بە من ناکەی ؟
کوتی :
بە چم بەخێو دەکەی ؟
کوتی :
بە نانی شوانی .
کوتی :
بەچم لێدەدەی ؟
کوتی :
بەوقوڵە گوچانەی .
مریشکە قوڵەزۆر ترسا کوتی :
دەمکوژی شووت پێ ناکەم .
دیسان وەڕێ بۆوە .تووشی مشکێک بوو. مشک کوتی :
مریشکە قوڵە بۆکوێ دەچی ؟
کوتی :مریشکە قوڵەودەردو سندان .
گوتی : ئەدی بلێم چی ؟
کوتی بلێ :
تەق تەقی کەوشان
پۆلی وەنەوشان
چارۆکە پیوازی
بە قەبزو نازی
بۆ کوێ دەچی ؟
مشکە کوتی :
تەق تەقی کەوشان
پۆلی وەنەوشان
چارۆکە پیوازی
بە قەبز ونازی
بۆ کوێ دەچی ؟
مریشکە قوڵە کوتی :
دەچمە شاری شوو کردن.
کوتی :شوو بەمن ناکەی ؟
کوتی : بە چم بەخێو دەکەی ؟
مشک کوتی :
هەرچی خۆشە بە زاران
کوتی :
بە چم لێدەدەی ؟
کوتی :
بەو کلکە قوڵە .

کوتی :
شووت پێ دەکەم.

مشک مریشکی بردە ژێرخانی ماڵە میری . ژیانیان دەست پێکرد .مریشکە قوڵە مەگیرانی بە دانوولەی گوڵەگەنمان دەکرد . دانووی دە دیزەی کرد و دەتەندووری نا . دانوو دەکوڵێ .مریشک چوو سەری بدا ،سەری دیزەی

هەڵگرت تێی کەوت ودا پلۆخا .مشک هاتەوە زۆری هەرا کرد کەس وڵامی نەداوە . هاتە سەر تەندووری دیتی مریشک لە تەندووری کەوتووە دەستی کرد بە گریانێ .دوایە دیزەی هەڵگرت وبردی یە سەر گوێلکێ وهەڵی رشت .

سەر گوێلک کوتی :ئەوە چیە ؟

مشک کوتی :

مریشکە قوڵەی خانکی یە
کەوتە دیزەی پانکی یە
نەیماوە ئێسقانکی یە

سەر گوێلک لە تاوان نیوەی سووتا .

قەلە رەشە بە قارە قار هاتە سەر گوێلکێ دیتی نیوەی سووتاوە.

کوتی :ئەوە بۆواتلێهاتووە؟

سەر گوێلک کوتی :

مریشکە قوڵەی خانکی یە
کەوتە دیزەی پانکی یە
نەیماوە ئێسقانکی یە

قەل لە تاوان هەموو پەڕوپۆی وەری.دوایە لە شەقەی باڵیدا چووە سەرتاقەدا رەکەی مەزرایە .

دار دیتی قەل پەڕوپۆی وەریوە کوتی :

ئەوە بۆواتلێهاتووە؟

کوتی :

مریشکە قوڵەی پانکی یە
کەوتە دیزەی خانکی یە
نەیماوە ئێسقانکی یە

دار تەواوی لک وپۆپی وەراند. ئاو بە لارولەنجەوتروسکە تروسک هاتەبن دارەکەی . گۆرانێکی خۆشی لەبن لێوی دەکوت .دیتی دار هەمووگەڵای وەراندووە.

کوتی :

دارەکە ئەوە بۆگەڵات وەراندووە ؟

دار کوتی :

مریشکە قوڵەی پانکی یە
کەوتە دیزەی خانکی یە
نەیماوە ئێسقانکی یە

ئاو لە تاوان قوڕاو بوو .هاتەبن گەنمەکان چڵەگەنم بەدم باوە دەشنانەوەو گۆرانێکی

خۆشیا . دەکوت .گەنم دیتیان ئاو قوڕا بووە .
کوتیان :

ئاو ئەوە بۆ قوڕاو بووی ؟

کوتی :

مریشکە قولەی خانکی یە
کەوتە دیزەی پانکی یە
نەیماوە ئێسقانکی یە

گەنمەکان لە تاوان سەروخوون بوون و ڕەگ و ریشەیان لە ئاسمانێ کرد . وەرزێر هات ودیتی گەنم سەراوبن بوون .

کوتی :

ئەوە بۆ واو لێهاتووە؟

کوتیان :

مریشکە قولەی خانکی یە
کەوتە دیزەی پانکی یە
نەیماوە ئێسقانکی یە

وەرزێر پێمەڕەکەی لە لاقی خۆی داو لاقی شکا . کچەکەی دیزەیەکی دۆکلێو لە سەر سەری دانا بوو بۆ بابی هێنا بووە مەزرایە . دیتی بابی لاقی شکاوە .

کوتی :

ئەیەڕۆ بابە ئەوە بۆوا تلێهاتووە؟

بابی کوتی :

مریشکە قولەی خانکی یە
کەوتە دیزەی پانکی یە
نەیماوە ئێسقانکی یە

کچ دیزە دۆکلێوی لە سەرڕا بە گیانی خۆی داکرد .هاتەوە ماڵێ دایکی لەبەر نانی بوو . دیتی کچەکەی هەموو گیانی دۆکلێوە .

کوتی :

هەک بابانت خرا نەبێ بۆوا تلێهاتووە ؟

کچ کوتی :

مریشکە قولەی خانکی یە
کەوتە دیزەی پانکی یە
نەیماوە ئێسقانکی یە

دایک لە تاوان مەمکی خۆی بە تەندوورەوەدا .

بەم جۆرە هەرکەس بەسەرهاتی مریشکە قولەی بیست بەلایەکی بەسەر خۆی هێنا .ئەمیش هاتمەوە لەولاڕا . کالەم دڕا ،چم پێ نەبڕا .

# رێنوێنی

**کاک فەرهاد**

نامەکەت گەیشت سپاست دەکەین.وێڕای جواب،ئەوە گۆواری سروەمان بۆ بەرێ کردی بەم هیوایە تۆش لە گۆوار و ڕۆژنامەتازەکانی دەوروبەری خۆت بێ بەشمان نەکەی و هاوکارێکی وەفاداری سروە بی.

**کاک شێرکۆعادڵ**

مەتڵەبەکەت گەیشت،هیوا ـ دارین لە داهاتوودا بتوانین کەلکی لێوەرگرین.

**خوشکەنەشمیل**

ئەم شیعرەی بۆت ناردووین زۆر بەناوبانگە و پێمان وایە کەمکوردهەیە کە نەی بیسبێ و یانەیخوێندبێتەوە تکایە شیعری تازەترمان بۆ بنێرە.

**کاک تەها کەریمی**

دەستەیەک دەڵێن سەید جەماڵەدینی ئەسەدئابادی خەڵکی ئەسەدئابادی هەمەدانە ودەستەیەک پێیان وایە خەڵکی ئەسەدئابادی ئەفغانستانە بەڵام بەبڕوای ئێمەش خەڵکی ئەسەدئابادی هەمەدانە.

٢ـ وڵامی پرسیاری دووهەمت لەژمارەکانی پێشووی سروە دایە.

**کاک ئەحمەدی ڕەحمانی**

ئاسەواری ماموستا هێمن ئەمانەن:

تاریک وروون ـ ناڵەی جودایی ـ هەواری خاڵی ـ پاشەرۆک ـ وەرگێڕانی قەڵای ـ دمدم وشازادە وگەدا،توحفەی موزەففەرییە.

**کاک مستەفا سۆفی عەلی ڕەواندووزی**

سپاسی هەستی گەرم وگوڕت دەکەین،هیواداریـن پەیوەندیمان لەگەڵ نەپسێنی.

**کاک عەلی بەهرامی**

نووسراوەکانت لەبەر دەستی دەستەی نووسەرانە، ئەگەر پەسندکرا خوا یار بێ لە ژمارەکانی داهاتوودا چاپی دەکەین.

**کاک عەلی سمایل زادە**

دەتوانی نووسراوەکانت بۆ سروە بنێری.لەسەر چاومانی دادەنێین،چاویان پێدا دەخشێنین و ئەگەر کەم و کووڕییەکی بوو ڕێنوێنیت دەکەین.

شیعری ئەم ئازیزانەمان پێگەیشتووە.لە ژمارەکانی پێشووی "سروە"دا رامانگە ـ یاندووە شیعرمان زۆر بۆ هاتووە لەبەر ئەمە پێمان نەکراوەجوابی هەموو شاعیرە لاوەکان بدەینەوە.وا لێرەدا ناوی هێندێکیان دەنووسین.

شیعری ئەم خۆشەویستانە یا لەباری وەزن وقافیەوە عەیبدارە،یالەباری زمانەوە پتەونیە،یالەباری مەزموونەوە لەسەر ڕێبازی فەرهەنگی و ئەدەبی سروە نیە.

ئەگەر نەمانتوانیوە جوابی یەک یەکی ئەم ئازیزانە بدەینەوە،دەبێ لێمان خۆش بن،بەڵام خودا یاربێ هەوڵ دەدەین، لە ژمارەکانی تری "سروە"دا لە سەرشیعر وتاربڵاو بکەینەوە بەو هیوایە کە بتوانێ جوابی هێندێک پرسیاری ئێوەی شیعردۆست بداتەوە.

**سەردەشت:** عومەر بێورانی محەممەد شیوەن.

**بانە:** عەبدوڵڵەدانیش ـ جەلال ڕەحیمی ـ ئازار ـ سامال ئەدەبی.

**ماسیەری بانە:** باقی ڕەحمانی محەممەدی عەبدوڵڵای. تەمۆغە.

**سەبەتلووی بانە: ک**.ع

**سەقز:** ئەحمەد ئەحمەدیان عەبدوڕەحمان فەهیمی جەمیل کەریمی ـ وەیلان ـ مەحموود حاجی ڕەحیمی مەحموود خالیدی ـ سەید محیەدین سەید قادری ـ عەباس عەبدوڵڵا وەکیلی ـ ئازادە

فەرزانە - مستەفا حوسێن پوور ناسر ئاغابرا - عەزیز کەیخوسرەوی .

**تورجانی سەقز:** خالیدئەحمەدی -

**لەگزی سەقز:** مەلا مەحموود ئیبنولخەیات .

**مەهاباد:** دیاکۆعەبدولکەریم پاسبارە- بەختیارمەحموودزادە مەحموود قەهوەیی - ئارێز سەید ئیسماعیل عەلی پوور ساکار- غەفوور ئابدانە مەحموود حاجی رەحیمی رەزا وەفا دووست- فەرهاد جەهان میهەن - تاهیرکەریمی عەلی رێبوار .

**بۆکان:** سەلاحەدین عەبدوڵلازادە سەلاحەدین عەزیزی - غەمخۆر- رەحیم کەریمزادە- یاسین رەحمانی - فەرهادشەریف زادە مامخەلیل - مستەفائیسماعیل پوور- ئەبووبەکر مەجیدی حەسەن تووسی - لوقمان ئەمیر عومەر ئەئیبامی - حوسێن سەلیمیان - ئەحمەد مەولانی ئەمیر مەجدی - عەبدولکەریم عەزیزنەژاد- جەلال عەشایری

**ئیسکی بەغدای بۆکان:** رەشید حەبیبی فەر.

**کولتەپەی بۆکان:** ع. م .

**داشبەندی بۆکان:** جەعفەر مەعرووف- سەید کەمال لەتیفی .

**یەنگیجەی بۆکان:** محەممەد کەریمزادە .

**سەمبەی بۆکان:** لوقمان چیا .

**سنە:** موزەفەر رەوشەن جەلیل پوورشاد- توفیق ئیبراهیمی - سالک - موختار شیخ حەسەنی - خالیدئەحمەدی فەرزین ئەردەلان .

**دۆلاوی سنە:** حیشمەت عەلی جانی

**مەریوان:** موسلیح ئەحمەدی محەممەد سالح مەریوانی .

**کرماشان:** عەلی خوسرەوی وەلی فەتاحی - سەیدمەسعوود هاشمی بەرزنجی .

**نەغەدە:** شێواو-کاکەلاوپشدەری

**شنۆ:** ر. حەسەنی - حوسێن وەلادەتی - مارف ئاغایی ئیبراهیم لەعلی سانی محەممەد چووکەلی .

**شێخانی شنۆ:** حاسڵ قادری .

**بابخالاوێ شنۆ:** مستەفا شێخە .

**گوندەوێڵەی شنۆ:** مستەفا گووری

**قەرەسەقەلی شنۆ:** محەممەد حوسێن پوور.

**پیرانشار (خانێ):** عەلی ئیسماعیل زادە- رەحیم باشیرپوور - ئەبووبەکر برایم پوور- عوسمان ئیسماعیل پوور- رەسوول قەلاتەرەش سیا مەخدلەیلان - سەلاحەدین حەسەنپوور- سەیدئیسماعیل سەیدشوکری .

**دێلزێی پیرانشار:** عەلی بەزرکار .

**ورمێ:** بێ ماف .

**بەندی ورمێ:** قاسم خەیاتی .

**پاوە:** گزنگ سلێمانی .

**خانەگای پاوە:** مستەفا رەحیمی

**تەورێز:** عومەرحیسامی سەعیدمحەممەدزادە- محەممەد شەمسەدینی .

**میاندواو:** رەشیدئەحمەدی ناسر مەعرووفی .

**تاران:** تاهیر فەتاحی رەحیم مەعرووفی .

**کەرەج:** سولەیمان محەممەد مستەفا .

**ئەندیمشک:** عەزیز ئازاد .

**جەلدیان:** عوسمان کانی رەش .

**زێوەی مەرگەوەر:** فەرهەنگ عەزیز .

**دزەی مەرگەوەر:** حەسەن مستەفاپوور .

**بروجرد:** خالید رەسوولی .

**سمنان:** کاوان بەرزنجی ئەمین مەلاشەریف محەممەد .

**ساین قەلا:** وریا .

عومەر سولەیمانی ئەنوەر عەزیزمراد

هوشیار کەریمی- عەبدوللا بایەزیدی - عەلی پەناهی - حوسین گورژی شارام زکری - **عەبدوڵلاعەتووف** ج.ا .جوتیار- رزگارئەمین

# پەندی پێشینیان

## مەتەڵ

هەشتی دەڕەقە
هەشتی دەزەقە
هەشتی هەنگاوە
زگ دڕەی ناوە
" گاوجووت "

بە نیوەی پڕە
بە پڕی نیوەیە
" مانگ "

بە منداڵی چوار لاقی هەیە
بە گەورەیی دوو لاقی هەیە
بە پیری سێ لاقی هەیە
"ئینسان "

سندووقی حەزرەتی سولەیمان
تێدایە هەم پیرو هەم جوان
" قەبر "

زەردە زەرنیق نیە
کلۆرە باسکە قەننە نیە
" گوڵی نێرگس "

لە وشتری بڵێندترە
لە شەکری شیرینترە
لە هەرزنی وردترە
" توو "

لە قەوزەی شینترە
لە قەندی شیرینترە
لە کارەبای زەردترە
" قەیسی "

● سەد جاری بگرە جارێکی ببڕە
● باران بباری ئاشی دەگەڕێ
● باران نەبارێ جووتی دەگەڕێ
● وشتر لە خەیاڵێکی
وشتروان لە خەیاڵێکی
● سووری دی سەمای لە بیر چۆوە
● هەموو شت بە خوێ خوێش بە مەعنا
● گورگ نازانێ ئێستر بە قیمەتە
● ئەگەر شەڕدەکەی باوانت ژیربێ
بەشی ئاش بوونەوەت لە بیر بێ
● لە هەورازی مەڵێ کوتنێ
لەبەر بایە مەکێشە توتنێ
مەچۆوە سەر ماڵە بابی ژنێ
● لە زۆر ژیاوان مەپرسە
لە زۆر گەڕاوان بپرسە
● قەرزی بدەی بە دۆستی
هەر دووک لە دەستت دەچێ
● ئاش هەر ئەوەندەی دێنێ
ئاشەوان بیقەپێنێ
● ئاورە سوورە لە خۆم دوورە
● در و سێحەب ماڵ رێک کەون
گای بە کولانەیدا دەردەکەن
● مانگا مردو دۆ بڕا
● ئەگەر بەماڵی بەمام و خاڵی
ئەگەر بێ ماڵی هەر بێتەماڵی .
● خاڵان خوارزا مەزن کرد
مامان برازا بزر کرد .

کابرایەک ماشینی بەکرێ دەگرت ،رووی لە شۆفیرێک کرد و گوتی :
ـ کاکەدەربەست بمبە بۆ شار چەندت دەمێ ؟
ـ دووسەد تمەن!
ـ جا ئەگەر وایە بەسەد تمەن بمبەوەدەرگایەکی بکەوە

راوچی یەک چووەراوێ بەڵام ماوەیەک گەڕاو هیچی وەدەست نەکەوت .
لە رووی هەڵنەدەهات بچێتەوە ماڵ ،لە رێگایە منداڵێکی دی کەروێشکێکی پێ بوو .کەروێشکەی کڕی وبە گوریس بەستی یەوەوهەڵیواسی سێرەی لێگرت قامکی بە پەلاپیتکەداهێنا بەڵام لە گوریسیدا و کەروێشک بەربۆوە و هەڵات .

. لێرەدا ،سپاسی کاک ئەحمە بەحری ـ خوشکە ئەختەر شێخەل ئیسلامی ـ کاک ئازاد عیسا ـ کاک سەید ئیسماعیل سەیدشوکری و باقی دۆستان دەکەین کە بۆ رازاندنەوەی ئەم بەشە یارمەتی یان داوین خودا ئاگاداریان بێ .

# شیعر

"صبای" شاعر لە بارەگای "فتحعلی خان" بوو. خان شیعرێکی بۆ خوێندەوە "صبا" گوتی: ئەسڵەن شیعر نییە. دەستووری دا سێ مانگ لە زیندانی کەن.

دوای ئازادبوون دیسان هاتەوە و "فتحعلی خان" شیعرێکی دیکەی بۆ خوێندەوە "صبا" هەستا وە دەرکەوت. گوتی:

ئەوە بۆ کوێ دەچی؟

صبا گوتی:

ـ قوربان دەچمەوە زیندان

ژنێک دەچووە بازاڕ بە کوڕەکەی گوت:

ـ ڕۆڵە وریا دەست لە شەمچە نەدەی مەترسی هەیە. وریا لە وەلامدا دەلی:

ـ نا دایە گیان خاتر جەم بە، خۆم فەندەکم هەیە

پیرێژنێک سواری ماشێنێک بوو کە پڕ بوو لە حەشیمەت جێگا هەموو گیرا بوو تەنیا جێگایەک لە پێشەوە بەتاڵ بوو چوو لە سەری دانیشت. شۆفیری ماشینەکە گوتی:

ـ دایە گیان ئەوە جێی منە. پیرێژن گوتی:

ـ دایک بە قوربانت بێ من پیرم ناتوتنم ڕاوەستم. خۆ شوکر تۆ لاوی.

## زەنگ

کابرایەک چووە لای سیمکێش و گوتی:

ـ براله ئاخر دوێنێ نەهاتم، نەمگوت زەنگەکەمان خراپ بووە. وەرە بۆمان چاک کەوە.

ـ بەسەری تۆ هاتم بەلام سەعاتێکم لە زەنگ دا کەس دەرکەی نەکردەوە.

## ماسی

شێتێک چەکوچێکی بەدەستەوە بوولەدم چۆم دانیشتبوو. سەعاتەکەشی لەئاوها ویشتبوو. یەکێک لێی پرسی ئەوە چدەکەی؟

ـ خەریکم ماسی دەگرم. ماسی دێ بزانێ سەعات چەندە منیش بەو چەکوچەی لەتەپڵی سەری دەدەم.

•••

دەگێڕنەوە شێخێکی بەناوبانگ لە گوندێکی کوردستان، زۆر پابەندی نوێژ و ڕۆژوو بوو، تائەو جێگایەی کە ئەگەر بیزانیایە یەکێک لە موریدەکانی بەڕۆژوو نیە سزای دەدا.

ڕۆژێک شێخ لەخانەقا دانیشتبوو، دیتی مجێور زاری دەبزوێ، زۆر ناڕەحەت بوو، گوتی: "کوڕە ئەوە بۆ بەڕۆژوو نی؟"

مجێور بەبزڕکاوی وسەرلێ شێواوی گوتی:

"قوربان... چۆن... چۆن شتی وا دەفەرمووی؟"

شێخ گوتی:

"ئەدی ئەگەر بەڕۆژووی، دەمت بۆدەجووڵێتەوە؟"

مجێور جوابی دایەوە:

"قوربان، ئەوە دوودەنکم قەیسی وشک بۆ بەربانگ دەخووسناوە."!

تێبینی: لە پڕ کردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی ڕێنووسی کوردی بەپێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆڤارە ڕەچاو نراوە جگە لەوەی نیشانەی (v) دانەنراوە . واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی ( شڕ، گوڵ، زۆر، شێر و . . ) ی تێدا بێ بە شکلی ( شر، کول، زور ، شیر و . . ) دەنووسرێ .

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ | ١٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | | | | | | | | | | | | ■ | | | ■ |
| ٢ | | ■ | | | | ■ | | ■ | | ■ | | | | ■ | |
| ٣ | | | | ■ | | ■ | | | | | | | ■ | | |
| ٤ | | ■ | | | ■ | | | | | ■ | | | | | |
| ٥ | | | | | | | ■ | | | | ■ | | ■ | | |
| ٦ | | | | | | | | | | | ■ | | | | ■ |
| ٧ | | | | | ■ | | | ■ | | | | | ■ | | |
| ٨ | | ■ | | | | ■ | | | | | | | | ■ | |
| ٩ | | | | | | | | ■ | | | ■ | | | | |
| ١٠ | | ■ | | | | | | ■ | | ■ | | | | ■ | |
| ١١ | | | ■ | | ■ | | | | ■ | | | | | | ■ |
| ١٢ | ■ | | | | ■ | | | | | ■ | | | | | |
| ١٣ | | ■ | | | | | | | ■ | | | | | ■ | ■ |
| ١٤ | | | | ■ | | | ■ | | ■ | | ■ | | | | |
| ١٥ | | | | | | ■ | | | | | | ■ | | | |

◀ ١- دوایین پارچە شیعری خودا لێخۆشبوو ماموستا هێمن - شیوودۆڵ - ٢- زاتوئیرادە - عێل و عەشیرە - ٣- کۆچەری - ئی "سیوەخان" بەناو بانگترە - کۆ - ٤- بنۆس و عیللەت - توندوموحکەم - بۆڵ ٥- کوێستانێکی سەرسنوور - کز و بەلەنگازی شیمال - ئاواڵی تەگبیر ٦- جێگای مێشک - غەوارە ونامۆ - گوڵێکی بۆن خۆش ٧- یۆسف بەکوردی - دووجار پیتێک - کوڕی شادی - مات وبێدەنگ ٨- جەنگەڵ - نێوەندی ئوستانێکی ئێران - ٩- بوونە ئاو - لا - نێرەی تەوارە ١٠- ئاژەڵێکی شیر بە بێچووەکەی نەدا - دووکیلۆ - ١١- ژمارەیەکە - بەرگی مردوو - پێی دەنووسین ١٢- زرینگە .....تا نەگلێ نابێتێ - بژیوی ئاژەڵ - ١٣- بەداس دەکرێ - پێداویستی ڕێگا ١٤- تازە - توندنیە - دڵۆپ ١٥- هین و هەرامە - زێدەی نووسەری شەرەفنامە - دوژمنی خودایە .

▼ ١- سەرداری موکریە و مەرقەدەکەی لە مەهابادە - شارێک و سروەی هەورامان - ٢- لە سنە "هەیە" - هۆزی بێسەر - بەم چەشنە ٣- نووسەری "ژان کریستف" - ڕیش - ٤- بلێسەی ئاگر - خۆشەویستی عەرەب - نەققاش ٥- دەرفەت - نیوەعەیب - خودا - بێئاو ٦- چێشتێکی کوردەوارییە - ڕستەی شانی ئەفسەر - ٧- قانوونی چەنگیز - مێژوونووسێکی یۆنانی کە باسی کوردیشی کردووە ٨- بەقەدروقیمەت - زوهرەی فارس ٩- ئەسبە و بەیت بێژەی بەیتی بۆ ئوسکارمان گوتووە -١٠- لە گرێوی منەتدا بەزمانی عەرەبی. میوەی پایز - ١١- دەنگی شێر - دزی سەروبن - لەم فەسڵەدا پڕ دەبێ لە دەغڵ ١٢- زیارەتگایەک لە جنووبی کوردستان ١٣- لووس - شارێکی هەمەدان - ١٤- گژوگیای کوێستان - پێشگری فیعلی موزاریع - کاس ١٥- باوەڕ - گەلەئەسپ - تاک نیە -

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ | ١٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ژ | ه | س | ک | ه | ن | د | ه | ر | ب | ه | گ | ■ | ن | م |
| ٢ | و | ه | ی | ش | و | و | م | ه | ■ | س | ی | و | ه | ر | ه |
| ٣ | و | ی | ڕ | ت | ■ | و | ■ | ک | ا | ت | ■ | ر | ه | خ | ت |
| ٤ | ر | و | ■ | و | ه | س | ن | ا | ■ | و | ت | ا | ر | ■ | ی |
| ٥ | ن | ا | و | گ | ا | ت | ■ | ر | ه | و | ا | ن | د | ز | ■ |
| ٦ | ■ | ن | ز | ا | ■ | ن | ش | ی | و | ■ | ه | ی | ■ | ه | ا |
| ٧ | و | ■ | م | ل | ک | ■ | و | ■ | ژ | ر | ی | ب | ا | ر | ■ |
| ٨ | ش | ن | ه | ■ | ل | ن | ی | ک | ■ | و | ر | ی | ■ | د | ش |
| ٩ | ت | ی | ل | ه | ک | و | ■ | ن | ی | و | ب | ژ | ی | ■ | ه |
| ١٠ | ر | ک | ه | ■ | ه | ی | ن | ■ | و | ت | ه | ■ | ه | ب | ر |
| ١١ | ه | و | ■ | گ | ل | ■ | س | م | ل | ■ | گ | ■ | خ | ه | م |
| ١٢ | ح | ز | ■ | ر | ه | و | ا | ن | ■ | م | ی | ر | س | ی | ■ |
| ١٣ | و | ی | ل | ■ | ق | ه | ا | ه | ت | ا | ج | د | ی | ن | ■ |
| ١٤ | ر | ا | و | ک | ه | ر | ■ | ت | ه | ل | ا | ی | ا | ه | ش |
| ١٥ | ه | ■ | چ | ر | ■ | د | ل | ■ | ■ | د | ف | ن | ■ | ت | ی |

**لەنێو ئەوکەسانەدا کە پڕکراوەی دروستی ئەم جەدوەلەمان بۆ بنێرن بەپێی قورعە یەک کەس بە بەرندە دەناسرێ .جایزەی بەرندەی جەدوەل بریتی یە لە ساڵێک ئابوونمانی گۆڤاری سروە .**

**پڕکراوەی جەدوەلی (٦)**

# سروەی نازپەروەرد

سروەی نازپەروەرد ،
سروەی نازەنین شۆخ نازپەروەرد
بەربادەهەندەی کۆگای داخ و دەرد
هام هەناسەی سۆنگ هەناسان سەرد
جای راز ونیاز خاتر پڕ خاران
مەحرەم نە حەلقەی زولف نازاران
تۆی جامەی نازک ئازیزان ماوا
بۆی شەمامە و بەی وەدەماخ یاوا
شەوبۆت چون شەوبۆی یەخەی لەیل دلکەش
چون شەوبۆی شاهۆ بۆی هەناسە وەش
سروە! سەد ئامان دەخیل یەڕاستەن
دوروا مەر جە من بێزاریت واستەن
نەی گەرمای هامن شەرای دۆزەخ بێز
هوورە و میشوولە ومیش جە سەرداریز
فێنکی شنەت ناما جە سەردا
تا بەخشۆ نەشئەی عەشقم وەبەردا
مەگەر نەشنەفتی کزەی نالەکەم
یام چزەی زامان قەدیم سالەکەم
گرەی هەردەی دڵ قەرقۆ کەردەکەم
جەهەفت ئاسمان دوو ویەردەکەم
سروە گیان تۆ تاوانم چێشەن
وەیتەوەر رەنگت رۆزگار پێشەن
بێمەیلی یاران کارێ کەردەن پێت
بەردەنی جەوێر قەدیم یار وێت
جەوا هێر سورمەی خاکپای بێگەرد
کام دلبەر ماری پەی شیفای چەمدەرد
بۆی بەهەشت ئاسای نامەی عەبیرین
جەکۆ ماوەری پەی خەستەی دیرین
دلبەر ئەو کەس بی دڵ جە (تاهیر) بەرد
دلدا ریش دەیری و شێتو شەیدام کەرد
ئیحیا کەرد دیسان فەسڵ جوانیم
کەردەش وە خەدەنگ بالای کەمانیم

ماتی و خامۆشی جە من گورێزا
عەشق و شۆروشەوق جە دەروون خێزا
مەست لایەشعەر وێڵ سەر بەرزان
نالەم لق وپۆی پیرەدار لەرزان
هەرچەند گۆش مەدام ئەو رێزەی رازش
دڵ خاستر مەبی ئەسیر نازش
دریغا دەولەت دیدار نامیش
بەهەشت مەحزەر بەرز گرامیش
جە شوومی بەختم پایدار نەبی
دل تێر جەو نیعمەت بەرخوردار نەبی